


دوکتۆر موحسین محەممەد حوسێن

# ژینامەی
# پیاوە هەرە درەوشاوەکە
# سەلاحەدینی ئەیوبی

وەرگێرانی:
عەبدوررەزاق بیسار
عەوف عەبدوررەحمان "شاخەوان کەرکوکی"

دکتۆر موحسین محەمەد حوسێن

# ژینامەی پیاوە هەرە درەوشاوەکە سەلاحەدینی ئەیوبی

وەرگێرانی:

عەبدورەزاق بیمار

پێداچوونەوەی

عەوف عەبدورەحمان "شاخەوان کەرکووکی"

دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس

هەولێر - هەرێمی کوردستانی عێراق

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
شەقامی گولان - هەولێر
هەرێمی کوردستانی عێراق
هەگبەی ئەلیکترۆنی aras@araspress.com
وارگەی ئینتەرنێت www.araspublishers.com
تەلەفۆن: 35 49 224 66 (0) 00964
دەزگای ئاراس لە ٢٨ تشرین (٢) ١٩٩٨ هاتووەتە دامەزران

دکتۆر موحسین محەمەد حوسێن
ژینامەی پیاوە هەرە درەوشاوەکە "سەلاحەدینی ئەیوبی"
وەرگێڕانی: عەبدورەزاق بیمار
پێداچوونەوەی: عەوف عەبدورەحمان "شاخەوان کەرکووکی"
کتێبی ئاراس ژمارە: ١٢٢٩
چاپی دووەم ٢٠١٢
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
چاپخانەی ئاراس - هەولێر
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ١٢٧ - ٢٠١٢
نەخشاندنی ناوەوە و ڕازاندنەوەی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
پێداچوونەوە و ڕێنووسی یەکگرتوو: بەدران ئەحمەد حەبیب

# پێشەکی

هەندێ مێژوونووسی سەردەمی سەلاحەدین لە باسی ئە سەرکردە هەڵکەوتووەدا، بەتایبەتی باسی لەدایکبوون و پلە و پایەیدا وێنەی وایان نەخشاندووە کە هەر لە خەون دەکەن، ئەمە بۆ ئەوەی لەگەڵ ژیانی دواتری ئەودا بگونجێ، هەندێ لەو چیرۆکانە کە لەبەر ڕۆشنایی سەردەمی دواتردا هەڵبەستراون بەڕاستی ڕوویان نەداوە.

نەخشاندنی ئەم جۆرە وێنانەش بەڵگەی بێ هاوتایی ئەم پیاوەیە لە کۆمەڵێ ڕەوشتدا کە بەو پایە تایبەتەیان گەیاندووە. ئەو پیاوە، پیاوێکی لاپەڕە گەش، سەرکردەیەکی ڕزگارکەر و دامەزرێنەری دەوڵەت بوو. خاچپەرستە داگیرکەرەکانیش هەزار حیسێبیان بۆ دەکرد، لەبەرئەوەی ئازا بوو و شەڕوانە موسڵمانەکانی یەک خست و ئامانجی بۆیان دیاری کرد، سەرەڕای ئەوەی لەبەر چاوی ئەوان سەرکردەیەکی سەرڕاست و جوامێر و سوارچاکی گرینگ بوو...

پێ دەچێ ئەوانەی ژینامە و مێژوو دەنووسنەوە وایان پێ باش بێ کە قارەمانان بەشەو لەدایک بن، چونکە لە شەوی تاریکدا مرواری زیاتر دەدرەوشێتەوە و خەڵک بەتاسەی زیاترەوە لێی دەڕوانن. عەرەبیش دەڵێن: "في الليله الظلماء يفتقد البدر = لە شەوی تاریکدا مانگ بەنرختر دەبێ"، هەر بەم واتایە فەیلەسووفی گەورەی ئەڵمان گوتویەتی: "کوندەپەپووی منیرڤا لە سەرەتای شەودا نەبێ ناچێتە ئاسمان"[1]، کوندەپەپوو لای ئەورووپاییەکان هێمای ژیرییە. هەروەها زانراوە کە پتەوترین بیر و لێکدانەوە و جوانترین کردەوە لە کاتی تاریکی و تەنگانەدا پەیدا دەبن.

سەلاحەدینیش وەکو ئەوە وایە لە تار و تەنگانەترین کاتدا درەوشابێتەوە و

---

١. د. أحمد محمود صبحي، في فلسفة التاريخ، مؤسسة الثقافة الجامعية - الاسكندرية ١٩٧٥، ل. ١٣٠

پێویستییەکی سەردەمی خۆی بووە و وەکو ڕۆڵەی چرکەدەمێکی بزوێنەری مێژوویەکی سەخت بووە و ژیانی بارتەقای یەک لەو ساتە نایاب و دەگمەنانەیە کە زەمانە پاش چاوەڕوانییەکی تاڵ نەبێ، پەیدای ناکات و نایبەخشێت.

بەڵێ، ناکرێ ئەم سەرکردەیە لەو ساتە مێژووییە دابماڵین کە پەیدای کردووە چونکە ئەگەر سەرکردەیەک بەناوی سەلاحەدینیش دەرنەکەوتایە دوور نەبوو بەناوێکی ترەوە دەربکەوێت. مەزنیی ئەم سەرکردەیە _وەک هەر سەرکردەیەکی تر- لەوەدایە کە بەئاگا بووە لەو بارە مێژووییە تاڵەی گەل و هاوئاین و کۆمەڵگەکەی تێدا ژیاون و تێ گەیشتووە کە نواندنی ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوە، کە کۆمەڵەکەی بگەیەنێتە کەناری سەربەستی و سەلامەتی، پێویستە سەلاحەدینیش ئەوەی کرد[2].

باشە چۆن ئەم پیاوە بە لووتکەدا هەڵکشا؟ سەرەتا چۆن بوو؟ چ دۆخێک یارمەتیی دا و پێی گەیاند؟ ئایا سروشتی ئەوەندە نائاسایی تێدا بوو کە لە کەسی تردا نەبێت؟ یان ئەم پیاوە چیی کرد بۆ ئەوەی لە گشت ئەو هەموو مەلیک و سەرکردە و ئازادانەی ماوەی دوو سەدە ململانێیان لەگەڵ (خاچپەرستەکان)کرد، بەناوباگتر بێت؟ بۆچی سەلاحەدین ئەو ناو و ناوبانگەی دەرکرد، نەک تەنیا لە بازنەی ڕۆژهەڵاتی عەرەبی ئیسلامیدا، بگرە لە بازنەی مێژووی کریستیانی ڕۆژئاوا و هەموو شەڕەکانی خاچپەرستیدا؟ تەنانەت ناوبانگی ئەو کاری کردە سەر درەوشاوەیی ناوی دوژمنە خاچپەرستە بەناوبانگەکەی -ڕیچاردی شێردڵ- مەلیکی ئینگلتەرا و سەرکردەی بەناوبانگترین هەڵمەتەکانی خاچپەرستان (هەڵمەتی سێیەم) چونکە سەلاحەدین لە داڕشتنی کەسایەتیی ئەو مەلیکەدا دەستی هەبوو. ڕیچارد لەبەرئەوەی بەرامبەر سەلاحەدین شەڕی کرد ناوبانگی دەرکرد، نەک لەبەرئەوەی عەکای گرت و کوشتارگەیەکی نامەردانەی بۆ موسڵمانانی ئەم شارە داخست. جا ئەم سەلاحەدینە کێیە؟

بەغدا – ١٩٩٢

---

٢. بڕوانە نامیلکەیەکی ئێمە بەناوی "موضوعان فی التاریخ الکردی"، بابەتی یەکەم، چاپخانەی ئەسعەد – بەغدا ١٩٧٦

## بنەماڵەی سەلاحەدین

سەلاحەدین، یوسف کوڕی ئەیووبی کوڕی شادییە و لە شادی بەولاوە ناوی باپیرانی تری نەزانراوە[٣]. ئیبن خەلەکان دەڵێ: زۆر لە ڕەچەڵەکی بەرەبابی ئەیووبم کۆڵییەوە، دوای شادی ناوی باپیرێکی ترم بەرچاو نەکەوت، هەتا زۆر نامەم دیت کە لەبارەی وەقف و موڵک و ماڵ بەناوی شێرکۆ (مامی سەلاحەدین) و ئەیووبەوە تەنیا نووسرابوو شێرکۆ کوڕی شادی، ئەیووب کوڕی شادی و بەس. بەلام هەندێ لە ئیختیارانی بنەماڵەکەیان پێمیان گوت: شادی کوڕی مەڕوانە[٤].

مێژوونووسان لەسەر ئەوە ڕێک کەوتوون کە باوک و کەسوکاری سەلاحەدین لە (دوین)ەوە هاتوون، کە شارێکە لەوپەڕی ئازەربێجان لەلای ئەڕانە، ئەوان ڕەوادین، ڕەوادیش تیرەیەکە لە هەزبانی، کە هۆزێکی گەورەی کوردانە.

پاشان ئیبن خەلەکان دەڵێ: مەلایەکی شارەزای خەڵکی (دوین) پێمی گوت: لەبەر دەرگای شاری دوین گوندێک هەیە پێی دەڵێن (ئەجدانقان) و گشت دانیشتووانی کوردی ڕەوادین، ئەیووبی بابی سەلاحەدین لەو گوندە هاتووەتە دنیا[٥]. مەلیک

---

٣. إبن أبي طي الحلبي (مێژوونووسێکی هاوسەردەمی سەلاحەدینە) کتێبە ونبووەکەی "كنز الموحدين فی سيره صلاح الدين"، کە ئەبو شامەی مەقدسی لە کتێبی "الروضتين فی أخبار الدولتين"، شتی لێ وەرگرتووە، چاپخانەی وادی النيل _ قاهيره ١٢٨٧-١٢٨٨ک، بەشی یەکەم، ل. ٢١٠ هەروەها: ابن خلكان "وفيات الاعيان"، چاپخانەی قاهيره ١٩٤٨، بەشی٦، ل. ١٣٩

٤. ابن خلكان "وفيات الاعيان"، چاپخانەی قاهيره ١٩٤٨، بەشی٦، ل. ١٤٠

٥. هەمان سەرچاوە، ل. ١٣٩ هەروەها: المقريزي "السلوك لمعرفة دول الملوك"، چاپخانەی دار الكتب المصرية - قاهيره ١٩٢٤، بەرگی ١ بەشی ١، ل. ٤٢ ابن تغری بردی "النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة"، چاپخانەی دار الكتب المصرية - قاهيرة ١٩٣٨، بەرگی ٦، ل١٢-١٣. الحنبلی "شفاء القلوب في مناقب بني أيوب"، خانەی الحرية بۆ چاپ - بەغدا ١٩٧٨، ل. ٢٣

ئەلموعیز ئیسماعیل کوڕی سەیفولئیسلام تەغتەدکین کوڕی ئەیووب، کە دەکاتە برازای سەلاحەدین و دوای باوکی بوو بە سەروەری یەمەن[٦]، هەوڵی دا بۆ خۆی و بنەماڵەکەی ڕەچەڵەکێکی درۆ هەڵبەستێ. "بەڵام کە مەلیکی عادل، ئەبوبەکر کوڕی ئەیووبی مامی گوێی لێ بوو پێی ناخۆش بوو، نامەیەکی گلەیی و سەرزەنشتی بۆ نووسی و فەرمانی پێ دا کە بگەڕێتەوە سەر ڕەچەڵەکی ڕاستی خۆی و واز لەو ئیشە بهێنێ کە بووەتە مایەی پێکەنینی خەڵک. ئەگەرچی بە قسەی مامی نەکرد، بەڵام ئەم ئیسماعیلە، وەکو سەرچاوە مێژووییەکان باسی دەکەن، پیاوێکی گەوجی بیر ئاڵۆز بوو و لەگەڵ سەرباز و سەرلەشکرانی خۆی باش بەڕێوە نەدەچوو، بۆیە لێی ڕاپەڕین و کوشتیان[٧].

شادی خۆی و خێزانی بە ئەیووب و شێرکۆی کوڕیەوە لە نیشتمان دەرچوو و گەیشتە بەغدا و مووسڵ[٨]، پاشان لە تکریت جێگیر بوو، تا لەوێ مرد و لەناو شارەکەدا گومبەزێک بەسەر گۆڕەکەیەوە دروست کرا[٩].

---

٦. ابن الأثير "الكامل في التاريخ"، چاپی دار صادر - بەیرووت ١٩٦٦، بەرگی ١٢، ل. ١٣
ابن خلكان: سەرچاوەی پێشوو، بەرگی٢، ل. ٥٢٤ الحنبلي "شفاء القلوب في مناقب بني أيوب"، ل ٢٢

٧. الكامل، ١٣/ ١٣٠ وفيات الاعيان، ٣/ ٥٢٤

٨. وفيات الاعيان، ٦/ ١٤١

٩. الروضتين، ١/ ٢١١ وفيات الاعيان، ٦/ ١٣٩ شفاء القلوب، ل ٢٣.

## ئەیووبی باوکی سەڵاحەدین

نەجمەدین ئەیووب لە (جەبەل جور) لەدایک بووە، بەڵام لە مووسڵ گەورە بووە و چووەتە خزمەتی محەمەد کوڕی مەلیکشای سوڵتانی سەلجووقی، ئەم سوڵتانە باوەڕی پێ بووە، کە دیویەتی پیاوێکی سەرڕاست و ژیر و مێرخاس و ئازایە کردوویەتی بە "پارێزگار"ی قەڵای تکریت"[10].

ئەیووب پیاوێکی ئاینپەروەر و جوامێر و خێرومەند و چاکەکەر بوو، زانایانی خۆش دەویست و لەگەڵ گەورە پیاواندا هەڵسوکەوتی دەکرد. زۆر چاک کارباری پاراستنی قەڵای تکریتی بەڕێوە برد و دز و ڕێگرانی پەرت و بڵاوە پێ کرد، ئیدی زەوی و زار ئاوا کرانەوە و گوزەرانی خەڵک باش بوو و ڕێگەکانی ئارام بوون.

پاش مردنی سوڵتانە سەلجوقییەکە لە ٥١١ک/ ١١١٧ز، سوڵتان مەسعود لە جێی دانیشت و میر ئەیووبی لە ویلایەتی تکریت هێشتەوە و فەرمانی چاوگێڕان بە کارباری ناوچەکانی هاوسنووریشی پێ دا. بەمە پایەی بەرزتر بوو، بەتایبەتی بەهۆی ڕەفتارچاکی و دەست و دەم پاکی. "خۆ یەکێک لە ئەهلی زانین بەلایدا تێپەڕ بووایە، بە پارە و پووڵ و میوانداریيەکی چاک بەڕێی دەکرد، کەس نەدەما لە ئاینپەروەرانی شارەکەی مووچە و بەراتیان پێ نەگەیەنێ"[11].

ڕۆژگار سووڕان و ئەو پێوەندییە دۆستییەی جارانی نێوان بنەماڵەی شادی و بەهروزی سەرەک شەحنەی بەغدا هەبوو (کە دەکاتە سەرپەرشتی پاسەوانیی شار) گرژ و ئاڵۆز بوو. دوای ئەوەی بەهروز بیستی شێرکۆ پیاوێکی ئەوی لە تکریت کوشتووە، داوای لە ئەیووب و شێرکۆ کرد کە لە شارەکە بار بکەن، ئەو کوشتنە بەتەواوی نێوان هەردوو لای تێک دا. دەستە و دایەرەی بەهروز توانییان زۆر بەخراپی دڵی لەوان کرمی بکەن و پێیان گوت بێدەنگ بوون لەو کارە

---

١٠. قەڵاپارێز، واتە: والی. وفيات الاعيان، ٦/ ١٤٢

١١. الروضتين، ١/ ٢١٠.

ئەنجامەکەی بەخراپ دەگەڕێ، بەتایبەتی کە خەڵکی تکریت زۆر باش هۆگری ئەیووب بوون: "دڵی دانیشتووانی بۆلای خۆی ڕاکێشاوە"[12]. هەندێ کەسیش چوونە لای بەهروز بە ئازایەتی و دەست و قامی شێرکۆ تۆقاندیان، کەوا خاوەن عەشیرەتێکی گەورەیە و لەوانەیە لە دوارۆژدا کردەوەیەکی خراپ بنوێنێ. بۆیە دەبێ زوو داوا لە ئەیووب و شێرکۆ بکات شارەکە بەجێ بهێڵن.

دوو کوڕەکەی شادی، زۆر دانەمان بۆ جێیەک خۆیان و خێزانیان ڕووی تێ بکەن و گورج عیمادەدین زەنگی ئەتابەگ کوڕی ئاق سەنقەری سەروەری مووسڵیان بەبیردا هات، کە وەختی خۆی ئەیووب پیاوەتیی لەگەڵ کردبوو، لەو دەمەدا کە خۆی و هەڤالانی لە بەردەم سوڵتان مەحموددا شکان و دنیایان لێ بەرتەنگ بوو و پەنایان بردە بەر تکریت.. عیمادەدین زەنگی بریندار بووبوو، پزیشکان لە تکریت برینەکانیان چارە کرد، ١٥ ڕۆژ مایەوە و بە پیاو و بەخۆراک و کەلوپەلی پێویستەوە بەڕێ کرا و بەرەو مووسڵ کەوتەڕێ، شێرکۆ لە ڕووباری دیجلە پەڕاندیەوە. "زەنگی ئەو پیاوەتییەی ئەیووب و براکەی لەبیر نەچوو، بۆیە دەست و دیاری و ڕووی خۆشی لێ نەبڕین." ئەمە یەکەم بەیەکگەیشتنی عیمادەدین و دوو براکە بوو، هەر بۆیەش هەردوو برا بەبێ دوودڵی دوای دەرکردنیان لە تکریت ڕوویان لەو نا. دوو برا و خێزانەکانیان خۆیان بۆ ڕۆیشتن ئامادە کرد و دانیشتووانی شار زۆریان پێ ناخۆش بوو ئەیووب لەناویان دەرچێت، بۆیە کەس نەما بۆ بەڕێ کردنیان لە شار دەرنەچێت و بۆ خەمی جیابوونەوەیان نەگری[13].

سەرچاوەکانی مێژوو دەڵێن کە چارەنووس وای خواست لەم شەوەدا ژنەکەی ئەیووب منداڵی ببێ، ئەیووب ڕەشبینانە لەم منداڵبوونەی ڕوانی و بەشوومی زانی، ناوی نا یوسف. ئەو یوسفە بوو کە دوایی بوو بە سەرکردە بەناوبانگەکە: "سەلاحەدین یوسفی کوڕی ئەیووب" هەروەکو خۆی بە ئەیووبی ئارامگر زانیوە، یەعقوبی ئارامگریش یوسفی پێغەمبەری بووە.

کە هەواڵی دەرکردنی ئەیووب و براکەی لە تکریت پێ گەیشت، عیمادەدین زۆری پێ خۆش بوو کە ڕوویان کردووەتە مووسڵ، فەرمانی دا بە ڕێز و شکۆوە پێشوازی

---

١٢. هـ.س.،١٠/٢١١

١٣. هـ.س.

بکرێن. پاشـان زۆر بەخێری هێنان و میوانداریـیەکی چاکی کردن و لە شـارەزوور ناوچەیەکی باشی پێیان دا. ئەمەش لە دەوروبەری ساڵی ٥٢٣ک/ ١١٢٨ز بوو.

وا دیارە جووتەبرا کارامەیی و دڵسۆزییەکی باشیان لە پشتگیریی حوکمی عیمادەدین زەنگیدا پێشان داوە بۆیە عیمادەدین کە لە سەرەتای ساڵی ٥٣٤ک/ ١١٣٩ز بەعلەبەکی گرت ئەیووبی کرد بە پارێزەری قەڵاکەی و یەکێک لە ناودارە گەورەکانی دەوڵەتی زەنگی.

عیمادەدین لە کن قەڵای جەعبەر کوژرا و دەوڵەتەکەی لە نێوان دوو کورەکەیدا کرا بە دوو بەش، بەشێک لە مووسڵ بۆ سەیفەدین غازی و بەشێک لە حەلەب بۆ نوورەدین مەحموود و تخووبی نێوانیان ڕووباری خابوور بوو.

ئەیووب و شێرکۆ لەم شارە جێگیر بوون، وەختێک کوڕانی نوغتەکین کە حوکمڕانی دیمەشق و دەوروبەری بوون ویستیان لە ئەنجامی دووبەرەکی و هەرای نێوان کوڕانی عیمادەدین زەنگی، بەعلبەک لە دەستی نوورەدین مەحموود دەربهێنن، ئەیووب دەیزانی کە لەشکری قەڵاپارێز بێ هێزە و کوڕانی عیمادەدین خەریکی هەرای ناوخۆیانن و شارەکە خۆی لەبەر هێرشی کوڕانی نوغتەکین ناگرێت، بۆیە بەرامبەر بە وەرگرتنی ١٠ گوندی تەنیشت دیمەشق شارەکەی بەبێ شەڕ بەدەستەوە دا. زۆری پێ نەچوو، بۆ دیمەشق باری کرد و لە دیوانی ئایبەکی کوڕە گەورەی نوغتەکین دامەزرا، ئەمیش ئەیووبی لەخۆی نێزیک کردەوە و لە تۆڵەی کردەوەی چاکی، پاداشتی دایە، تا کردی بە سەرلەشکری هێزەکانی شام.

هەرچی شێرکۆیشە، لە حەلەب لای نوورەدین مەحموود مایەوە و گەلێک دڵسۆزی و ئازایەتیی نواند، بۆیە نوورەدین مەحموود کردی بە سەرلەشکری هێزەکانی حەلەب. پێوەندیی نێوان سەروەری حەلەب و سەروەری دیمەشق ئاڵۆز بوو. جاروبارێش بەشەڕ دەهاتن و هەوڵیان دەدا موڵک و زەوی و زار لەیەکتر بپچڕن، ئەوەبوو دەسەڵاتی نوورەدین مەحموود پەرەی سەند و بیری بۆ ئەوە چوو هەموو بەشەکانی شام بخاتە سەر میرنشینییەکەی خۆی و بەرەیەکی بەهێز پێک بهێنێ تا پەلاماری بنکەکانی خاچپەرستان بدات.. ئەوسا لە کۆتاکانی ساڵی ٥٤٧ک/ ١١٥٤زدا بە سەرکردایەتیی شێرکۆ لەشکرێکی ناردە سەر دیمەشق و گەمارۆی دا، سەرلەشکری هێزەکانی دیمەشق کە ئەیووب بوو، خۆی بۆ بەرەنگاری

و پاراستنی دیمەشق کۆکردەوە.

بێ گومـان ئـەوەی ڕووی دا کـارێکی سـادە نەبوو، هەردوو برا نەیانویست دژی یەکتر بوەستن و سۆز و خۆشەویستیی دڵیان _نەوەکا یەکتر تووشی مەترسی بکەن- کەوتە ململانێ لەگەڵ هێزی ئەرکی سەرشان و دڵسۆزییان بۆ شانشینەکە -نەوەکـا بە ڕێککەوتنی ژێر پەردە لەگەڵ یەکتردا تاوانبار بکرێن – لەوانەشە هەڵوێستی ئەیووب سەختتر بووبێت، چونکە خۆی و لەشکرەکەی بەرامبەر بە لەشکری نوورەدین مەحمەوودی کوڕی ئەو عیمادەدین زەنگییە وەستابوون کە خۆی و شێرکۆی برای دوای دەربەدەری لە تکریت گرتەوە و پەنایانی دا و میوانداریانی کرد، سەرباری ئەوەش دەیزانی لەشکری دیمەشق ناتوانێ ماوەیەکی زۆر خۆی لەبەر پەلاماردەر ڕابگرێت، بۆیە بڕیاری دا لەگەڵ براکەی بکەوێتە وتووێژ بەڵکو ڕێک بکەون و بەبێ خوێن ڕژان کێشەکە ببڕێتەوە و ئەم هێزانە بۆ لێدانی خاچپەرستان بەکار بهێنن.

دانوستاندنی نێوان دوو براکە نێزیکی حەفتەیەکی پێ چوو، لە کۆتادا ڕێک کەوتن کە دیمەشق خۆی بەدەست نوورەدین مەحمەوودەوە بدات، ئەویش یەکسەر ئەیووبی کرد بە سەروەری شارەکە و بوو بە یەکێک لە میر و سەروەرەکانی دەوڵەتی نوورەدین مەحمەوود و نێزیکترین کەسانی. هەندێ مێژوونووس باس دەکەن کە پلەی ئەیووب لە کن سەروەری حەلەب لە پلەی شێرکۆی برای، کە پێش لەشکری (مقدم) هێزەکانی حەلەب بوو، بەرزتر بوو، ئەیووب لای نوورەدین ئەوەندە بەڕێز بوو کە لە مەجلیسی ئەودا بەبێ ئەمری خۆی کەس دانەدەنیشت ئەیووب نەبێت، ئەوانی دیکەی وەکو شێرکۆ و کەسانی تر دەبوو بە پێوە بوەستن هەتا فەرمانی دەدا دابنیشن[١٤].

گرتنی دیمەشق لەلایەن نوورەدین مەحمەوودەوە خاڵی وەرچەرخانی گرینگ بوو لە مێژووی شەڕەکانی خاچپەرستاندا، چونکە دوای ئەم هەنگاوە، شام بە سەرۆکایەتیی نوورەدین یەکی گرت، هەر لە (ڕەها) لە باکورەوە تا حۆران لە باشوور، بوو بە دەوڵەتێکی یەکگرتوو، پایەتەختەکەی دیمەشق بوو، لە سەرێکی

---

١٤. د. سعید عبدالفتاح عاشور، الناصر صلاح الدین یوسف، قاهیرە ١٩٦٥، ل٦٩، لە دەستنووسی نوەیریی وەرگرتووە "نهایە الأدب"، بەرگی٢٥، ل. ١٨٠

تریشەوە گرتنی ئەم شارە جۆرە هاوسەنگییەکی لە نێوان هێزەکانی ئیسلام و هێزەکانی داگیرکەری خاچپەرست لە شامدا دروست کرد، چونکە ئەگەر خاچپەرستەکان هەموو کەناراوەکانی شامیان، لە ئیسکەندەروون (ئەنتاکیە) لە باکورەوە هەتا غەزە لە باشوور داگیر کردبێت، ئەوا نوورەدینیش دیمەشقی خستە سەر دەوڵەتەکەی و حوکمێکی لایەنگری دوژمنی لەناو برد و باشووری وڵاتی شام و ناوچەی جزیرەی فوراتی هەتا ڕووباری بەڕەدا خستە ژێر چنگی هێزێکی یەکگرتووی نیشتمانییەوە[١٥].

ئیتر تا ئێرە، با دەست لە باسی دوو براکە هەڵگرین و هەوڵ بدەین باسی ژینامەی سەربازێکی گەنج بکەین کە یوسفی کوڕی ئەیووبە و لە باوەشی خێزانێکدا پەروەردە بوو دوو سەرکردەی گەورەی وەهای تێدا هەڵکەوت کە دەستێکی بالایان هەبوو لە هەردوو شاری حەلەب و دیمەشقدا لە شام. پاش تکریت و موسڵ لە عێراق.

١٥. عاشور، سەرچاوەیەکی پێشووتر، ل٥٨.

## سەڵاحەدین یوسف کوڕی ئەیووب

سەڵاحەدین لە سەردەمێکدا لە شام پێ گەیشت خاچپەرستەکان هێشتا بەهێز بوون و نیو سەدە بەسەر داگیرکردنی ناوچەی جەزیرە و کەناراوەکانی شام و فەلەستیندا، قودسیش لە ٤٨٩ک/ ١٠٩٦ی زاینەوە تێپەڕ بوو. خاچپەرستەکان گشت ناوچەکەیان لە بەردەستدا بوو، میرنشینی (ڕەها) نەبێت کە عیمادەدین زەنگی ساڵی ٥٣٩ک/ ١١٤٤ز لێیانی سەندەوە. خاکی عەرەب لەو ڕۆژانەدا تووشی کۆمەڵێک کێشە و گرێ و گۆڵ بووبوو بەهۆی پێوەندیی خراپی نێوان سەروەرانی و گومان و دووبەرەکیی نێوانیان. هەروەها لەبەر هەبوونی کۆمەڵێک دەوڵەت و میرنشین لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای جیهانی ئیسلامیدا. دووبەرەکیش لە نێوان دەوڵەتی عەباسی لە بەغدا و دەوڵەتی فاتیمی لە میسر لەوپەڕی توندیدا بوو. سەرباری ئەمانەش دەوڵەتێکی بەهێزی موەحیدەکان لە مەغریب دامەزرا و گێچەڵی حوکمڕانی عەرەب و ئیسلام لە ئەندەلوسیش بەردەوامیی هەبوو.. لە بەغداش دەوڵەتی خەلیفە تێ دەکۆشا شکۆی جارانی لە دەستی سەلجوقییەکان دەربهێنێت و لە ململانییەکی بەهێزدا بوو بۆ ژیاندنەوەی خیلافەت. شامیش گۆڕەپانی ململانێی چەندان لایەن و هێز و مەیدانی دووبەرەکیی نێوان خیلافەتی بەغدا و قاهیرە بوو، سەرباری داگیرکاریی خاچپەرستەکانیش کە تا ڕادەیەک ئەنجامی ئەم هەڵوەشان و دووبەرەکییەی سەر خاکی عەرەب بوو[١٦].

ئەمە باری سیاسی بوو لەو کاتەدا کە بنەماڵەی ئەیووبییان، ڕاستتر دوو براکە ئەیووب و شێرکۆ، دەستیان دایە کار لە تکریت، پاشان لە حەلەب و دیمەشق. کە

١٦. لەبارەی هۆکارگەلی شەڕی خاچپەرستانەوە، بڕوانە: محمد عبدالله عنان "فكرة الحروب الصليبية" لە کتێبی "مواقف حاسمة في تاريخ الإسلام"١٩٦٢ د. جوزيف نسيم يوسف، الدافع الشخصي في قيام الحروب الصليبية، گۆواری کۆلیجی ئەدەبیات – ئیسکەندەرییە، ژمارە١٦ی ساڵی ١٩٦٣. د. صالح العابد، الحروب الصليبية _ دوافعها وبواعثها الممهدة، گۆواری المورد، بەرگی١٦، ژمارە٤، ١٩٨٧.

سەلاحەدین ساڵی ٥٣٢ک/ ١١٣٨ز لە قەڵای تکریت لەدایک بوو، نێزیکی ٤٠ ساڵ بوو داگیرکەرانی خاچپەرست گەیشتبوونە شام و فەلەستین و سەلاحەدین لە گۆنگەلی ئەو هات و باتەدا گەورە بوو. پاش ئەوەی عیمادەدین زەنگی ساڵی ٥٣٤ک/ ١١٤٠ز بەعلەبەکی گرت و ئەیووبی کرد بە والیی شارەکە، سەلاحەدین لەم شارەدا منداڵیی خۆی ڕابوارد و لە بچووکییەوە ئاگەداری مەترسیی بەردەوامی دەستدرێژیی خاچپەرستان بوو، دوای ئەوەی بوو بە ١٤ ساڵ واتا ساڵی ٥٤٦ک/ ١١٥١ز هەستی کرد دوژمن پەلاماری دەشتی بیقاعی دا کە شاری بەعلەبەکی لێیە و باوکی بەرەنگاریان بوو و بەچاوی خۆی دیتی چی ڕوو دەدات و داگیرکەر چ وێرانییەکی لە ناوچەکەدا کردووە. پێشتریش زانیبووی کە چۆن لەشکری میرنشینی ئەنتاکیا بە سەرکردایەتیی میر بوهیمەند (البیمند) کوشتنی (زەنگی)ی بە هەل زانی و هێرشی بردە سەر پارچەکانی باکور و ناوەندی وڵاتی شام، ئەو میرە خاچپەرستە عەسکەری خۆی کردە دوو بەش، بەشێکی بەرەو حەما بەڕێ خست و بە بەشەکەی تر پەلاماری حەلەبی دا و وێرانکاریی خستەوە. ئەوسا بۆ تۆڵەسەندن شێرکۆ بە لەشکری حەلەبەوە پەلاماری (ئەرتاح)ی داگیرکراوی دا.. بێگومان ئەم ڕووداوە و ڕووداوگەلێکی تر کاریان لە دەروونی یوسفی لاو کرد، کەوا لە دەورووبەرێکدا پەروەردە بوو ململانێی نێوان خاوەن خاک و داگیرکەر توند و بەتاو بوو. یوسف لە دیمەشق لای باوکییەوە چووە لای مامی لە حەلەب، لەوێش مامی پێشکێشی نوورەدین مەحموودی کرد. ئەویش قبووڵی کرد و موڵک و ئاوایی باشی پێ دا[17].

خاچپەرستەکان، سەرەڕای ئو گورزانەی نوورەدین مەحموود لە بنکەکانیانی سرەواند، بەهێز بوون، بەڵکو هەر دەرفەتێکیان شک ببردایە خاکی تریان داگیر دەکرد. ئەوە بوو ساڵی ٥٤٨ک/ ١١٥٣ز شاری عەسقەلانیان داگیر کرد[18]. بێگومان ئەم داگیرکردنە سەلاحەدینی زۆر تووڕە کرد و ئازاری دا و ئاستی

---

١٧. الروضتين،١/ ٨٤.

١٨. عەسقەلان شارێکی فەلەستینە، کەوتووەتە سەر کەناری دەریای ناوەڕاست لە نێوان غەزە لە باشوورەوە و یافا لە باکورەوە، لەبەر جوانی و خۆشیی ناسناوی "بووکی شام"ی پێ درابوو. یاقوت الحموی، معجم البلدان، خانەی صادر و خانەی بەیرووت ١٩٥٥-١٩٥٧، بەرگی٤، ل. ١٢٢.

هۆشیاریی بەرز کردەوە، بەڵام هیچی بۆ نەدەکرا، دەبوو دان بەخۆیدا بگرێ و چاو لە نوورەدین مەحموود ببڕێ کە چەند جار هەوڵی دا عەسقەلان ڕزگار بکات و بۆی نەکرا. ئەم شارە هەر بە داگیرکراوی مایەوە هەتا سەلاحەدین ساڵی ٥٨٣ک/ ١١٨٧ز ڕزگاری کرد وەکو دواتر باسی دەکەین. داگیرکردنی عەسقەلان مایەی بیرەوەریی تاڵ و ناخۆشی وا بوو کە لەسەر پەردەی هۆش و زەینیدا بڕیارەکانی دواڕۆژیان نەخشاند. سەلاحەدین بە چاودێریی هەردوو سەرکردە بەخێو کرا، باوکی لە بەعلەبەک و دیمەشق، مامیشی لە حەلەب و لە سێبەری سەرکردەی گەورە نوورەدین مەحموود. شێرکۆش یەکە ناوداری سەرکردایەتیی سوپا بوو لە دەوڵەتی نوورەدیندا، بەڕادەیەک ئیبنوئەسیری مێژوونووسی ئەو سەردەمە، دەڵێ: ئەسەدەدین شێرکۆ گەورەترین میری نوورەدین بوو، پلەی هێندە بەرز بوو، وای لێ هات دەتگوت هاوبەشی ئەوە لە مەلیکایەتیدا[19]. نوورەدین بێ پرس و ڕای ئەو شتێکی نەدەکرد[20].

لە هەوارەکانی دیمەشق و حەلەب و بەعلەبەکدا، یوسفی لاو فێری تەکنیکی کوشتار و شەڕوانی بوو، زۆر جۆر زانستی مرۆڤانەی خوێند و بەو پێیە کە کوڕی والیی دیمەشق و برازای سەرکردەی هێزەکانی حەلەبە زانایانی سەردەم پێیەوە خەریک بوون و بایەخیان پێ دا. قورئان و حەدیس و شەرعی خوێند، سەرباری تەکنیکەکانی سوارچاکی لە یاریی چەوگان[21] و هونەرەکانی تری ڕۆڵەکانی چینی کاربەدەستان. لە بەردەستی هەندێک مەلای گەورە و زانای وڵاتی شام دەرسی خوێند، بەڵام حەزی لە کتێبەکانی فەلسەفە و مەنتیق نەدەکرد[22]. لەوانەشە هۆی ئەمە جۆری پێگەیشتنی سەربازانەی بێت کە وا دەخوازێت لە کاتی گرژی و تەنگانەدا گورج بڕیار بدات و چاوەڕوانی بێنەوبەرەی وتووێژ و بیروڕای جیاواز نەکات. هەر بەم جۆرەش گوێی نەدەدا بە قسەی ئەستێرەناسان (مونەجیم).

---

١٩. ابن الأثير، الباهر في تاريخ الأتابكي، خانەی الكتب الحديثة – قاهيرة ١٩٦٣، ل١٦٨

٢٠. ابن قاضي شهبة الأسدي "الكواكب الدرية في السيرة النورية"، خانەی الكتاب الجديد _ بەیرووت ١٩٧١، ل٤٢-٤٣

٢١. چەوگان: یارییەکی کۆنی ڕۆژهەڵاتییە، تیایدا یاریکەران بە سواری ئەسپەوە و بە گۆچانی درێژ لە تۆپێکی دارین دەدەن.

٢٢. الروضتين ٢/ ,٢١٩ شفاء القلوب، ل٦٢

سەلاحەدین دوای گەڕانەوەی لە گەشتی یەکەمی بۆ میسر[23]. کە تەمەنی ٢٨ ساڵ بوو لە ساڵی ٥٦٠ک/ ١١٦٥زدا بۆ هاوکاریکردنی باوکی لە سەرۆکایەتیی پۆلیسی دیمەشق دامەزرا، کاریاری سەرۆکی پۆلیسیش پاراستنی هێمنی و سیستم و ڕێکخستنی باج کۆکردنەوە بوو. سەلاحەدین زۆر لێهاتووانە ئەرکی خۆی ڕاپەڕاند، بە جۆرێک کەوتە بەر دڵی شاعیران کە قەڵەمی پیاهەڵگوتنیانی خستە کار، شاعیرێکیان ناوی (عەرقەلەی کەلبی)یە کە ساڵی ٥٦٧ک/ ١١٧١ز مردووە، گوتوویەتی:

رويدكم يا لصوص الشام فإني

لكم ناصح في مقالي

و إياكم من سمي النبي

يوسف رب الحجا والجمال

فذاك مقطّع أيدي النساء

وهذا مقطّع أيدي الرجال[24]

(ئەی دزینەی لە شامێ، ئارامتان بێ من ئامۆژگاریتان دەکەم، وریابن لە هاوناوی پێغەمبەر، یوسفی ژیر و جوان، ئەویان دەستی ژنانی بڕی، ئەمیان دەستی پیاوان دەبڕێت.)

بەم جۆرە پیاو دەتوانێ ژیانی ئەو لاوە لەو ماوەیەدا بێنێتە بەر چاوی خەیاڵ، لە هەوارە جوانەکانی شام و بەچاودێری و سۆزی باوک و مامی، لە بەعلەبەکی پڕ باخ و ڕەزدا دەگەڕا و لە دەم ڕووباری پڕ لە داروباری بەرەدا و بە خۆشگوزەرانی دەژیا.

سەری لە سوختەخانە و قوتابخانەکانی دیمەشق دەدا تا لە زانستەکانی ئیسلام بەهرە وەربگرێ، پاشان ڕوو دەکاتە دەشت و بیابانی کاکی بەکاکیی شام و لەسەر سوارچاکی و ڕاو و ڕمبازی مەشق دەکات و زۆر چاک لێی سەردەکەوێت. بە پێویستیشی دەزانێ بچێتە کۆڕی مزگەوتی ئەمەوی و گوێ لە وتاری شێخە

٢٣. لە لاپەڕەکانی داهاتوودا، باسی هەرسێ هەڵمەتەکە دەکەین.

٢٤. سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، چاپی حيدر آباد الدكن، هيندستان ١٩٥١، بەشی ١، بەرگی ١، ل.٢٥٢ شفاء القلوب، ل.٦٦

گەورەکـان بگرێت، وەکو عـەبدوڵلا کوڕی مـحـەمـەد کوڕی عـەسـڕوون (لە ٥٨٥ک/ ١١٨٩زدا مـردووە). بێگومـان هـەمـوو ئەوانەی زانیوە و ئەزمـوون و شـارەزاییـیـەکی زۆری لێیان دەستگیر کردووە، لە ئەنجامدا مەردایەتییەکی بێ وێنە و کەسێتییەکی هەڵکەوتەی لێ بەرهـەم هـات و هـەمـوو ڕەوشـتـە نایابەکانی سـوارچـاکی، ئازایەتی، جوامێری و ڕەوشت بەرزیی زیاتر لە هـەموو سوارێکی تر لەو هـاتنە دی[٢٥]

٢٥. قدري قلعجي "صلاح الدين الأيوبي رجل غير وجه التاريخ"، أعلام الحرية، خانەی العلم للملايين، بەیرووت ١٩٥٦، چاپی سێیەم، ل. ٣١

## ژوانی مەزنی لە میسر

هێزی دەستدرێژی خاچپەرست لە کەناراوی شام و فەلەستین و لە قودس و دەورووبەری جێگیر بوون، بە ڕەوە لە ناوەڕاست و ڕۆهەلاتی ئەورووپاوە دەهاتن و لە گەرووی دەردەنیل دەپەڕینەوە، دەهاتنە ولاتی ڕۆم (ئەنادۆل) و لە ڕێگەی باکوری شامەوە سنووریان دەشکاند و دەهاتنە ناو خاکی عەرەب. ئەم هێزانەش وەک نەریت هەڵیان دەکوتایە سەر باکور و باکوری ڕۆهەلاتی ئەم ولاتە، کە چ هێزێکی ئیسلامی ڕووبەڕوویان نەدەوەستا. بەلام کە زەنگییەکان لە باکوری عێراق و شام و جزیرەدا دەسەلاتیان پەرەی سەند و نوورەدین مەحموود دیمەشقی خستە سەر مەملەکەتی خۆی -وەک باسمان کرد- بزووتنەوەی پەلهاوێشتنی خاچپەرست لە ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی کۆچی، دوازدەی زاینییەوە، ڕێگەی پەلاماری گۆڕی و ڕووی کردە باشووری ڕۆهەلات، لەسەر حیسابی میسر و دەوڵەتی فاتیمی[٢٦] و مۆڵکی لە خاکی فەلەستیندا. بەلام خاچپەرستەکان هەتا هەلومەرجی ئەم ئامانجە گرینگە نەگونجا، نەخشەی داگیرکردنی میسریان بەئەنجام نەهێنا، کە دەبوو زۆر چاک خۆیانی بۆ ئامادە بکەن، ئەمەشیان کاتێک بۆ کرا کە میسر بوو بە پاروویەکی نەرمەقووتی وەها کە بە بێ زەحمەت کێشانێکی زۆر قووت بدرێت.

لە ڕاستیدا باری سیاسیی دەوڵەتی فاتیمیی میسر، پاش ئەوەی عەسقەلانی دوا بنکەی فاتیمییەکان لە فەلەستین کەوتە دەست بلدوینی سێیەمی مەلیکی بەیتولەقدیس (١١٤٣-١١٦٢) لە ساڵی ٥٤٨ک/ ١١٥٣ز، بەتەواوی شلەژا. دوژمنان بێ دەسەلاتیی حوکمی میسریان بە هەل زانی، بەتایبەتی ململانێ لەسەر پایەی وەزیری و پیلان و ڕەشەکوژی و دووبەرەکی. کە وایان کرد چەند خەلیفەیەکی کەم دەسەلات بێنە سەر کار، (حوکمڕانیی) ولات کەوتە دەست ئەو

٢٦. حوکمڕانیی فاتیمی لە میسر لە ساڵی ٣٥٨ک/ ٩٦٩ز، لە سەردەمی خەلیفە المعز (دامەزرێنەری قاهیرە) دەستی پێ کرد و بە خەلیفە العاضد ساڵی ٥٦٧ک/ ١١٧١ز بەکۆتا هات.

کەسەی بتوانێت بەسەر بەرھەڵستانیدا زاڵ بێت، (کە زاڵ دەبوو خەلیفە دەیکرد بە وەزیر) ھەتا بوو بە باو یەکێک لە خۆی ڕابینێ و چاوی لەو پایەیە ببڕێ و بتوانێ دەسەڵات پەیدا بکات و وەزیر بکوژێت.. یەکسەر جێی دەگرتەوە و دەبووە وەزیر. ئیبن ئەسیر گوتەنی "الوزارات صارت لمن غلب"[27]. ئەم مێژوونووسە زیرەکە زیاتر بارەکە ڕوون دەکاتەوە و دەڵێت: خەلیفەکان لە دوای پەردەوە بوون و وەزیرەکانیش دەتگوت مەلیکن، کەم وا بووە پاش وەزیرول ئەفزەل (ساڵی ٥٢٤ک/ ١١٣٠ز کوژرا) یەکێک بووبێتە وەزیر ئەگەر لە ئەنجامی شەڕ و کوشتن و شتی وا نەبووبێت.

قازی بەھادین کوڕی شەداد دەگێڕێتەوە: ھێزی میسرییەکان (واتە فاتیمییەکان) برێتی بوو لە عەسکەری وەزیر کە پێیان دەگوت سوڵتان[28]. ئەوە بوو ئەفزەلی وەزیر بەدەستی مەئموون بەتایحی کوژرا، بەتایحیش بەدەستی ئەحمەدی کوڕی ئەفزەڵ کوژرا، ئیتر تا حوکمڕانیی فاتمییەکان بەکۆتا گەیشت یەک بەدەستی یەکتر دەکوژران. ئەم بارە ناھەموارە کاری کردە سەر ھەموو لایەنێکی ژیانی وڵات، بەتایبەتی باری ئابووری، نرخی شمەک و خواردەمەنی دووچەندانە زیادی کرد، بەتایبەتی نان، ڕۆن، برنج و وای لێ ھات جگە لە ئاشەوانەکان گەنم بە کەس نەدەفرۆشرا[29]. کار بەوە گەیشت خەڵک گۆشتی کەلاکی گەنیویان دەخوارد، ڕێبوارانیان دەڕفاند، گۆشتی ئێستر و لەسێدارە دراوانیان دەخوارد[30]. لەناو ئەو لێشاوی خوێن و برسێتی و قاتییەدا (ئەل)ی برای خەلیفەی پێشووی

---

٢٧. الکامل، ١١/, ١٨٥

٢٨. ابن شداد، النوادر السلطانیة والمحاسن الیوسفیة "سیرة صلاح الدین"، چاپی خانەی میسری، قاھیرە ١٩٦٤، ل, ٣٦

٢٩. المقریزی "المواعظ والاعتبار بذکر الخطط والآثار" (الخطط) چاپی بولاق ١٢٩٤ھـ، بەرگی ٢، ل٢١٧

٣٠. المقریزی "إغاثة الأمة"، خانەی ابن الولید، قاھیرە ١٩٥٦، ل٢٣-, ٢٤ لەبارەی قاتوقڕی و برسیەتییەکانی میسر لە سەردەمی فاتیمییەکاندا بڕوانە: ابن الصیرفی المصری "الاشارة الی من نال الوزارة" چاپخانەی پەیمانگەی زانستیی فەرەنسایی، قاھیرە ١٩٢٤، ل, ٤٣ ھەروەھا: المقریزی "اتعاظ الحنفاء بأخبار الأئمة الفاطمیین الخلفاء"، چاپخانەکانی ئەھرامی بازرگانی، قاھیرە ١٩٧١، بەرگی ٢، ل١٦٤، ١٦٥، ١٦٩، ١٧١، ٢٧٩، ٢٨٠، ٢٩٨,

میسر، کە لە تەمەنی ١٥ ساڵیدا مرد، بوو بە خەلیفە، ئەمەشیان ١١ ساڵان بوو. تەلایەع کوڕی ڕزیکی ئەرمەنیی وەزیر (کە عەباسی وەزیری پێشووی کوشت) پلانی ساز کرد و کچی خۆی لە خەلیفە منداڵەکە مارە کرد بۆ ئەوەی بە بەردەوامی دەست بەسەر حوکمدا بگرێت. پاشان ساڵی ٥٥٦ک/ ١١٦١ تەلایەع کوژرا و ڕزیکی کوڕی کارباری وەزارەتی گرتە دەست، بەلام شاور ئەلسەعدی والیی شاری (قوص) لە سەعیدی میسر بەسەریدا زاڵ بوو، ڕزیک ڕای کرد پاشان کوژرا. شاور بۆ ماوەی ٨ مانگ وەزیریی میسری کرد و لەناکاو زرغامی کوڕی سواری لەخەمی سەرکردەی سوپای میسر لێی هەڵگەڕایەوە و بەسەریدا زاڵ بوو، شاور ڕای کردە شام و زرغام بوو بە وەزیر. ئەم وەزیرەش لەناوەوە و لە دەرەوەدا سیاسەتێکی کورتبینی پەیڕەو کرد، بۆیە ڕۆژ بەڕۆژ گلۆڵەی ولات بەرەو لێژی دەچوو، بۆ نموونە بڕیاری کوشتنی هەموو سەرکردە لایەنگرەکانی شاوری دا و بەم کارە زیانێکی گەورەی بە دەزگاکانی سەرکردایەتیی سوپا گەیاند[٣١].

ئەگەر ڕاستت دەوێ بەردەوامیی ژیانی دەوڵەتی فاتیمی لە میسر لەو ڕۆژگارەدا هەر لەبەر ئەوە بوو کە هیچ داگیرکەرێکی بەهێزی وا نەبوو لە دەوروبەری میسردا زەبرێکی توندی تێ بسرەوێنێ و لەناوی ببات. ئەم شڵەژانی باری ناوەخۆیەش ولاتی بێ هێز کرد، بۆیە هێزەکانی بیانی بیریان لەوە کردەوە هەلەکە بقۆزنەوە، چونکە خراپیی باری میسر لە چوارچێوەی ناوەخۆیی دەرچوو و گەیشتە بورای دەوڵەتان[٣٢].

ڕاکردن و پەنابردنی شاور بۆ شام، لای نوورەدین مەحمود، وەکو بڕیارێک وا بوو بۆ کۆتا پێهێنانی حوکمی لاوازی فاتیمی بەدەستی ئەم سەرکردەیە، شاور داوای لێی کرد یاریدەی بدات تاوەکو بگەڕێتەوە سەر پایەی وەزیرایەتی لە میسر، بەرامبەر گەلێ بەڵێنی ئارەزوو بزوێن و دەستپێشکەریی چاک، بەلام نوورەدین لە بەرامبەر خواستەکەی شاوردا دوودڵیی نواند، چونکە بڕوای بە شاور نەبوو،

٣١. ابو الفدا "المختصر في أخبار البشر"، چاپخانەی دار الكتاب اللبناني، بەیرووت، بەرگی ٥، ل.٥٦

٣٢. د. عبدالقادر احمد اليوسف "علاقات بين الشرق والغرب، بين القرنين الحادي عشر والخامس عشر"، لە بەلاڤۆکەکانی کتێبخانەی العصرية، سەیدا - بەیرووت ١٩٦٩، ل١٢٥.

لەوەش دەترسا یاریدەدانی وەزیرێکی لەکارخراو ببێتە مایەی ئەنجامێکی تاریک. ئەمە لەلایەک، لەلایەکی تریشەوە باری خراپی میسر خاچپەرستەکانی بزواند تا سویا بنێرن و داگیری بکەن.

سەبارەت بە گرینگیی ولاتەکە و دەرامەتی بێ رادەی[33] و بوونی بە دەرگای باشووری لێوە هاتنی شالاوی خاچپەرستەکان، پاش ئەوەی هێزە راپەریوەکانی ئیسلام لە باکوری شام و عێراق دەرگای باکوریان لە خاچپەرستەکانی رووم لە قودس گرت، سەرباری ئەوەش خاچپەرستەکان بەتایبەتی مەلیکی مەملەکەتی خاچپەرست لە قودس لەوە دەترسان نوورەدین مەحموود هەلی باری ناوخۆی میسر بەکار بهێنێ و داگیری بکات، بەتایبەتی کە وەزیری پێشووی میسر هانای بۆ بردووە. هەر دەمێکیش دەسەلاتی بگاتە میسر، مەملەکەتی بەیتولمەقدیس دەکەوێتە نێوان دوو بەرداشەوە، ئەوەشمان لەبیر نەچێت پێشتر فاتیمییەکان بۆ رزگارکردنی عەسقەلان پێوەندییان بە نوورەدین مەحموودەوە کردبوو، بۆیە ئەمرۆ لە هەموو رۆژێ زیاتر بووە جێی مەترسیی خاچپەرستەیل.

بەڵێ، مەلیکی قودس، ئەمووری یەکەم کە تازە هاتبووە سەر تەخت، خۆی بۆ گرتنی میسر ئامادە کرد. هەتا مێژوونووسە گەورەکانی کریستیانی وەکو ولیام سوری و میخائیل سریانی[34] باسیان کردووە کە مەلیکی پێشووی قودسیش (بلدوینی سێیەم) ساڵی ٥٥٥ک/ ١١٦٠ز بە تەواوی بیری لە داگیرکردنی میسر کردووەتەوە و ئاژاوەکەی دوای کوشتنی خەلیفە ئەلفایزی بەهەل زانیوە. بەلام کارگێرانی میسر توانیویانە لە بڕیارەکەی پاشگەزی بکەنەوە بەو مەرجەی سالانە ١٦٠ هەزار دیناری بدەنێ. ئەوجا مەلیکی تازە بەبیانووی ئەوەی میسرییەکان گفتی خۆیان تا سەر نەبردووە خۆی بۆ گرتنی میسر ئامادە کرد و ساڵی ٥٥٨ک/ ١١٦٣ز هەڵی کوتایە سەر ناوچەی دەلتا، هەتا گەیشتە شاری بلبیس[35] و

٣٣. رنسیمان "تاريخ الحروب الصليبية"، وەرگێرانی د.الباز العريني، چاپی خانەی الثقافة، بەیرووت ١٩٦٨، بەرگی ٢، ل٦٧٣.

٣٤. د.سعید عبدالفتاح عاشور "الحركة الصليبية"، کتێبخانەی ئەنگلۆی میسری، چاپخانەی لیژنەی البيان العربي، چاپی ١٩٦٣، بەرگی ١، ل٦٨١.

٣٥. بلبیس شارێکە لەسەر رێگەی شام، ١٠ فەرسەخ لە فستاتەوە دوورە، یاقوت الحموی، ١/٤٧٩.

گەمارۆی دا. بەڵام زرغامی وەزیری میسر سوودی لە لافاوی نیل بینی کە هەموو جۆگە و زەویوزار ژێرئاو کەوتن و هەوڵی دا پلانەکانی ئەمووری سەر نەگرن و ناچاری بکا بکشێتەوە بۆ مەملەکەتی خۆی لە فەلەستینی داگیرکراو.

ئەگەرچی ئەم هێرشەی خاچپەرستان سەرنەکەوت بەڵام بۆیان بەکەڵک بوو و لە بێدەسەڵاتیی حوکم و لە زۆریی خێر و سامان و ئاسان داگیرکردنی میسر ئاگەداریانی کرد.. مەلیک ئەموریشی هان دا هەڵمەتێکی گەورەتر ڕێک بخا تا بتوانێ بیگرێ. هەوڵ و تەقەلای خاچپەرستەکان ترسی خستە دڵی نوورەدین، بۆیە خێرا پەلاماری چەند مۆڵگەیەکی خاچپەرستەکانی دا لە شام، تا ناچاریان بکات لە میسر بکشێنەوە.

بەم جۆرە میسر لە کۆتاکانی دەوڵەتی فاتمیدا بوو بە نێچیرێکی بەردەست و پێویست بوو سەروەری شام لەگەڵ کات و دوژمندا بکەوێتە کێبەرکێ و نەهێڵێ نێچیرەکە ڕاو بکات، چونکە دەیزانی هەر کەسێک میسری هەبێ دوژمنی پێ دەشکێنێ و ئەگەر دوژمن میسر بگرێت، دەرکردنیان لە فەلەستین و شام گرانتر دەبێت.

هەردوو لا، شامی و خاچپەرستەکان، خۆیان بەرەو میسر ئامادە کرد، نوورەدین مەحموود ساڵی ٥٥٩ک/ ١١٦٤ز کارباری سەرکردایەتی و ڕێکخستنی هەڵمەتەکەی بە شێرکۆی سەرکردەی سوپا سپارد بۆ یاریدەدانی شاور دژی زرغام لەلایەکەوە و بۆ پاراستنی وڵات لە تەماح و هەڵمەتی چاوەڕوانکراوی خاچپەرستان لەلایەکی ترەوە. هێزەکەی شێرکۆ، جگە لە پیادە، هەزار سواری تێدا بوو، سەلاحەدین یوسفی برازای و شاوریشی لەگەڵدا بوون[٣٦]. نوورەدین مەحموودیش ڕووی کردە بنکەکانی خاچپەرستان بۆ ئەوەی نەهێڵێ ڕێ لە هەڵمەتەکەی شێرکۆ بگرن[٣٧].

زرغام کە هەستی بە مەترسی کرد هاواری بۆ خاچپەرستەکان برد و گفتی بە مەلیکی قودس دا کە ئەگەر دژی شاور یارمەتیی بدەن، میسر بخاتە بەر دەستی

---

٣٦. المقریزی، الخطط، بەرگی ٢، بەشی ١، ل١٥.

٣٧. ابن واصل "مفرج الکروب فی أخبار بنی أیوب"، چاپخانەی زانکۆی فوئادی یەکەم، قاهیرە ١٩٥٣، بەرگی ١، ل١٣٨.

ئەوان، بەڵام خێرایی لەشکری شێرکۆ و لێهاتوویی لەچارەکردنی کاربادا ئەو هەلەی لە دەستی زڕغام سەند، ئەوە بوو بەر لە گەیشتنی هێزەکانی خاچپەرست، شێرکۆ گەیشتە دەلتا و هێزێکی سوپای زڕغامی بەزاند.

پاش ئەو سەرکەوتنە، شێرکۆ بەرەو قاهیرە کەوتە ڕێ، لەوێ زڕغام خۆی بێ کەس و بێ پشت و پەنا دیت، پیاوەکانی و خەڵکی میسر لێی تەکینەوە، هەروەها خەلیفەی فاتیمی (ئەل بیللا) کە هیچی لەدەست نەدەهات دان بەخۆدا گرتن و چاوەڕوانیی هەل نەبێ بۆ دەربڕینی تووڕەیی لەو ناپاکی و گۆڕانکارییە ناڕەوایانەی لە وڵاتدا ڕوویان دەدا. زۆری پێ نەچوو، زڕغام وەختێ ویستی ڕا بکات و پەنا بباتە بەر خاچپەرستان هاتە کوشتن[٣٨]. ئەمجا شاور جارێکی تر وەزیرایەتیی کەوتەوە دەست.

کێشە و ململانەیەکی تازە لەنێوان شێرکۆ و شاوردا ڕووی دا، کاتێ شاور پشتی لەو کەسە کرد کە لە شامەوە هات بۆ یاریدەدانی و وای کرد میسر لەبەردەم داگیرکەراندا خۆی بگرێت. شاور گەڕایەوە سەر خووی جارانی لە بێبەڵێنی و نامەردی، هەروەکو مێژوونووسێکی میسر گوتوویەتی[٣٩]، کەوتە ئازاردانی خەڵک و ئەو گفتانەی بە نوورەدین مەحموودی دابوو هەموویانی لەبیری خۆی بردەوە، لەمەش زیاتر بڕیاری دا ئەو پارەیەی لەسەری ڕێک کەوتبوون نەیداتە شێرکۆ و داواشی لێ کرد خۆی و سوپاکەی لە میسر بچنە دەرەوە. شێرکۆ لە ناپاکیی شاور تووڕە بوو، لە تۆڵەی ئەمەشدا بلبیس و ئەلشەرقییەی گرت. شاوریش، وەکو زڕغامی پێش خۆی، ملی لە نامەردی نا و هاواری بۆ دوژمن برد و بەڵێنی بە مەلیک ئەموری دا ئەگەر بۆ وەدەرنانی شێرکۆ یاریدەی بدات پارەیەکی زۆری دەداتێ.

مەلیکی خاچپەرست بە پەرۆشەوە بەپیری داخوازیی شاورەوە چوو و لەشکری ئامادە کرد و خۆی سەرکردایەتیی کرد و بۆ داگیرکردنی میسر و گەمارۆدانی هێزەکانی شام لە هەموو لایەکەوە بەڕێ کەوت. شێرکۆ هێشتا هەر لە کن بلبیس

---

٣٨. ابن العديم "زبدة الحلب من تاريخ حلب"، چاپخانەی کاتۆلیک، بەیرووت ١٩٥٤، بەرگی ٢، ل. ٣١٧ ابن خلكان "وفيات الاعيان"، ٢/٤٤٢.

٣٩. ابن تغرى بردى "النجوم الزاهرة": ٤/٣٤٧.

دای کوتابوو، کەوتە ناو ئەو داوەی ئەموری و شاور بۆیان نایەوە و لە توانیدا نەبوو سوپای هەردوو لا ببەزێنێ، بۆیە لەگەڵیاندا ڕێککەوت کە هێزی هەردوو لا لە میسر دەرچن، شاوریش بەڵێنی دا کە ۲۰۰۰ دینار بداتە شێرکۆ. مەلیکی خاچپەرستیش سەیری کرد دەبێ بە ڕێک کەوتنەکە قایل بێت و لە میسر دەرچێت، چونکە هێزەکانی نوورەدین مەحموود زۆر بەتاو پەلاماری بنکەکانی خاچپەرستانیان دەدا لە مەملەکەتی بەیتولمەقدیس بۆ تەنککردنی تەوژمی هێزی دوژمن لەسەر شێرکۆ و ڕێ نەدان بە سەرکەوتنی دوژمن لە پلانی داگیرکردنی میسردا.. بۆیە بوو ئەموری خاکی میسری بەجێ هێشت.

وەکو سەرنج دەدرێت لەو هەڵمەتەدا ڕۆڵی سەلاحەدین زۆر ڕوون نییە و ناتوانین باش دیاریی بکەین، ئەگەرچی بەهادین ئیبن شەداد، ژینامەنووسی سەلاحەدین و نووسەرانی تریش، دەڵێن کە لەو هەڵمەتەدا سەلاحەدین جێی باوەڕی مامی بووە و مامی بێ پرس و ڕای ئەو بڕیاری نەداوە، چونکە دەیدیت بیر ڕاست و لێکدانەوەی دروستە و ئەنجامی کاری سەرکەوتووانەیە[٤٠].

هەرچۆنێک بێت، ساخ بووەتەوە کە چوونی لەگەڵ مامی لەم هێرشەدا و ئاگەداریی لە باری میسر و تێکەڵبوونی بە گێژاوی ئەزموونی سەختی سوپا، بەهرەی شەڕوانانی مشتومالّ دا و شوێنەوارێکی قووڵی لە دەروونیدا بەجێ هێشت و ئەزموون و دنیادیدەیی لەلا زیاد کرد.

هەردوو لا، شامی و خاچپەرست، بەدەستی بەتاڵ لە میسر گەڕانەوە، بەڵام هەردوو لا لە گرینگیی میسر و شوێنی بایەخدار و حوکمە بێهێزەکەی دڵنیا بوون. هەردوو لاش خۆیان بۆ گەڕێکی تر ئامادە کرد و هەریەکە لە پەلپ و بیانوو دەگەڕا بۆ ئەوەی گەڕانەوەی بۆ میسر ئاسان بکات. هەروەکو مێژوونووسانی ئەو سەردەمەش باسیان کردووە، شێرکۆ کە لە میسر دەرچوو لە شام دای کوتا و مشووری چوونەوە بۆ میسری دەخوارد، تاکو ئەو خاکە نەکەوێتە ژێر چنگی خاچپەرستان و ئەرکی ڕزگارکردنی فەلەستین و کەناراوی شام سەختتر نەبێ، چونکە مەترسیی داگیرکردنی میسر لە مەترسیی داگیرکردنی قودس کەمتر نابێت. بۆیە (گەڕانەوە) بووە خولیای سەرکردەکانی شام، هەرچی نوورەدین

٤٠. النوادر، ل. ٣٧

مەحموودە، شێرکۆ و گەورە پیاوانی دەوڵەتیش لەگەڵیدا - وای بەچاک دەزانی پەلە نەکەن نەوەکو هێزەکانی شام لە نێوان باکور و باشووردا پەرت بن، لەبەرئەوەی دۆخەکە لە وڵاتی شام خۆیشیدا وریایی و ئامادەیی زۆری دەویست.

بەڵام هەر کە سەروەری شام دەرفەتی بۆ ڕێک کەوت فەرمانی بە سەرلەشکرەکەی و برازاکەی دا کە ئامادەی گەڕی دووەم بن، ئەمەش پاش نێزیکی سێ ساڵ لە هێرشی یەکەم، واتە لە ٥٦٢ک/ ١١٦٧ز، کاتێک خەلیفە خۆی هاواری بۆ نوورەدین مەحموود هێنا و پێی ڕاگەیاند کە شاوری وەزیر یەکلایەنە دەستی بەسەر کاروباردا گرتووە و زۆر و ستەمکاریی بێ سنوورە و خوێنی زۆری ڕشتووە. ئەمجارە شێرکۆ سوپایەکی دوو ئەوەندەی جاری پێشووی پێکەوە نا[٤١].

شێرکۆ لێکی دایەوە لەوانەیە شاور جارێکی تر پەنا بۆ ئەمووری بباتەوە، بۆیە هێرشی نەکردە سەر قاهیرە نەوەکو هێزی خاچپەرست و هێزی شاور گەمارۆی بدەن و لە نێزیک (جیزە)وە لە نیل پەڕییەوە و سوپای خۆی لەبەری ڕۆهەڵاتی نیل، بەرامبەر بە فستات (قاهیرەی کۆن) دامەزراند.

لێکدانەوەکەی شێرکۆ لەجێی خۆی بوو، بەڵێ شاور بۆ جاری دووەم هاواری لێ هەستا و داوای لە مەلیکی خاچپەرست کرد فریای بکەوێ. ئەویش خێرا خۆی ڕێک خست کرد بۆ گرتنی میسر. بەڵام پێشەکی داوای کرێ و نرخی ئەو فریاکەوتنەی لە شاور کرد، کە دەبێ پەیمانێ مۆر بکات بەر لە شەڕکردن دژی شێرکۆ و دەرکردنی لە وڵات، خەرجی و نرخی هێرشەکەی بداتێ. شاوریش پەیمانی دا ٤٠٠ هەزار دیناری بداتێ، نیوەی ئێستە و نیوەشی دوای شەڕەکە. شایانی باسە ئەم ڕێککەوتنە وای گەیاند کە داگیرکردنی میسر لەلایەن خاچپەرستانەوە بوو بەکارێکی ڕەسمی و بوونە پارێزگاری میسر و خیلافەتی فاتیمی.

ئەمووری خەریک بوو لە ڕووباری نیل بپەڕێتەوە و لەگەڵ سوپای شاور پێکەوە پەلاماری شێرکۆ بدەن کە لە بەری ڕۆژئاوای ڕووبارەکە دامەزرابوو. شێرکۆ هەستی بە مەترسیی هەڵوێستەکە کرد، بۆیە ئەوێی بەجێ هێشت و ڕووی کردە (سەعید)، بەڵام هێزی هەردوو لا دوای کەوتن و نێزیک شاری ئەشمونین، ١٠ میل لە دووری شاری (منیا)، بەرەنگاری یەک هاتن و لە جومادای ئاخیرەی ٥٦٢ک/ نیسانی

---

٤١. الکامل:١١/ ,٣٢٤ الباهر:١٣٣.

١١٦٧ز شەڕی (البابین) ڕووی دا. لەم شەڕەشدا سەلاحەدین کە سەرکردەی (قلب)ی سوپاکە بوو دەورێکی دیاری هەبوو. سوپای شام توانیی _ سەرەڕای زۆری و گەورەیی، سوپای خاچپەرست هێزە هاوبەشەکە ببەزێنێ. ئەمووری جارێکی تر خۆی کۆ کردەوە و لە نێزیک فستات دامەزرایەوە. ئەو سەرکەوتنەی شێرکۆ لەبەرچاو مێژوودا زۆر سەیر بوو، چۆن دوو هەزار سوار دەتوانن لەشکری میسر و فەرەنگەکانی کەناراو ببەزێنێ[٤٢]؟

ئەمەش بە شانازییەکی گەورەی ئەفسەری لاو سەلاحەدین دەژمێردرێت، بۆ ئەو وەکو دەرسێکی گرینگ بوو، شارەزای بنەواکانی خۆڕێکخستنی گشتیی سوپا و پەیڕەوی شەڕی لێ دە و هەڵێ (کر وفر) بوو و تەکنیکەکانی سەریان لە دوژمن شێواند[٤٣].

شێرکۆ بۆ چنینەوەی بەری سەرکەوتنەکەی بەرەوژوور چوو تا ئیسکەندەرییەش بگرێت، لەوێدا سەرکردە و خەڵکی شار بەگەرمی بەپیریەوە هاتن و تووڕەیی خۆیان لە ڕێککەوتنی وەزیری وڵات لەگەڵ داگیرکەرانی خاچپەرست دەربڕی و بێزارییان لە بێدەسەلاتیی حوکمی میسر پێشان دا، بۆیە دەرگای شاریان بۆ کردەوە تا دڵنیا و بەڕێزەوە بێتە ناو شار. شێرکۆ ویستی ئیسکەندەرییە بکاتە بنکەی کاری شەڕوانی و کارگێڕیی خۆی و یەکێ لە کۆشکەکانیشی کرد بە گرتیگە[٤٤]. بەلام وای بەچاک زانی، ئیسکەندەرییە بەجێ بهێڵێ و سەلاحەدین لە جێی خۆی بکا بە سەروەری شار و، گوتی: من ناتوانم خۆم لەم شارەدا گیر بکەم. بڕیاری دا بە هێزێکەوە بچێتە سەعید، ئەوەبوو دەستی بەسەردا گرت و کەوتە کۆکردنەوەی پارە و سامان بۆ بژێوی سوپاکەی[٤٥].

هەرچی خاچپەرستانیش بوون لێ نەگەڕان سەلاحەدین بحەسێتەوە و ئیسکەندەرییە وەکو پاروویەکی نەرمەقووت بۆ دوژمنەکەیان بەجێ بهێڵن، بۆیە لە

٤٢. الکامل:١١/ ٣٢٦. الذهبي "العبر في خبر من عبر"، چاپخانەی حکوومەتی کوەیت ١٩٦٣، بەرگی ٤، ل١٧٦.

٤٣. د.سعداوي، نظیر حسان "التاریخ الحربي المصري في عهد صلاح الدین"، کتێبخانەی النهضة المصریة، قاهیرة ١٩٥٧، ل١١.

٤٤. الروضتین، ١/١٦٨.

٤٥. هـ.س: ١/١٤٥.

فستاتەوە بەرەو ئیسکەندەرییە هەڵکشان، تا گەمارۆی بدەن. سەلاحەدین ئەم هەواڵەی بە مامی گەیاند، شیرکۆش سەعیدی بەجێ هێشت و بەهاواری برازاکەیەوە چوو.

مانەوەی سەلاحەدین بەتەنیا و سەرکردایەتیکردنی سوپا هەلێکی چاک بوو زۆر تەکنیکی کارگێڕی و حوکمڕانیی فێر کرد[٤٦].

لە ئەنجامدا هەردوو لا بۆیان نەکرا کارەکە یەکلا بکەنەوە، بۆیە -جارێکی تر- بڕیاریان دا بە ڕێککەوتن هەردوو لا میسر بەجێ بهێڵن و دیلەکانی شەڕ ئاڵوگۆڕ بکەن. ئەم کردەوەیەش بە سەرکەوتنی شاور دەژمێردرا، بەلام ئەموری پێی لێ داگرت و وتی لە میسر ناچمە دەرەوە تا دەستکەوتێکی دارایی و بەشی شێرم بەرنەکەوێت، داوای کرد مەملەکەتی بەیتولمەقدیس بەرپرسیاری پاراستنی میسر بێت و هێزێکی خاچپەرست بۆ پاراستنی دەرگاکانی قاهیرە بمێنێتەوە، (شەحنە)یەکیشیان لە میسر هەبێ وەکو نوێنەرێکی بالای[٤٧] مەلیکی خاچپەرست لە نەخشەکێشانی کارباری حوکمڕانیی میسردا، سەرباری دانی باجێکی ١٠٠ هەزار دیناریی سالانە بەشێوەیەکی بەردەوام[٤٨].

هەموو ئەم کار و کردەوانە لە ولات ڕوویان دەدا، بێ ئەوەی خەلیفەی فاتیمی دەنگی لێوە بێت، چونکە لەو ڕۆژەوەی حوکم کەوتە دەست وەزیرەکان خەلیفە هیچ دەسەلاتێکی نەما، وەزیرەکان بە کەیفی خۆیان چییان بویستایە دەیانکرد، شاوریش بەتەواوی بەسەر خەلیفەدا زاڵ بووبوو. ئیبن ئەسیر دەڵێ ئەمەش مانای وایە لەو ناوەدا هەر شێرکۆ زیانی پێ کەوت و بەدەستی بەتاڵ لە میسر گەڕایەوە، سەرباری پێ چەقاندنی خاچپەرستان لە زەویی میسردا.

بەلام لەبەرئەوەی جڵەوی کارباری ولات لەدەست ڕۆڵەکانی خۆی دەرچوو بوو و دەوڵەتی فاتیمی نەیدەتوانی گرفتەکانی حوکمڕانی چارەسەر بکات و سوپایەکی

---

٤٦. علي بيومي "قيام الدولة الأيوبية في مصر"، خانەی الفكر الحديث، قاهیرە ١٩٥٢، ل١٢٣.

٤٧. كارل بروكلمان "تاريخ الشعوب الاسلامية"، خانەی العلم للملايين، بەیرووت ١٩٦٥، بەرگی ١، ل٣٥١.

٤٨. الباهر: ١٣٤. تغري بردي "النجوم الزاهرة": ٥/٣٤٩.

نەبوو وڵاتی پێ بپارێزێت و کاربەدەستانی بۆ چارەسازی ڕوو لە دەرەوە نەکەن. دەبوو یەک لەو دوو هێزانە -خاچپەرست یان شامی- لە هەوڵی گرتنی میسردا سەربکەوێت.

بۆیە هەردوو لا خۆیان ئامادە دەکرد و لە بیانوویێک دەگەڕان (هەروەکو هێرشەکەی دووەم).

خاچپەرستەکان، دوای ئەو تەقەلایانەیان بۆ داگیرکردنی میسر، ئەبولحاسن تەغری بەردی دەڵێ "عەورەتی میسریان دەرکەوت و تەماعیان تێ کرد". زۆری پێ نەچوو مەلیکەکەیان هەلێکی نوێی بۆ ڕەخسا کاتێ دیتی شاور -کە دنیای بۆ تەخت بوو- لە ڕووی خاچپەرستانی پارێزەری بەرهەڵستی پێشان دەدا و دوودڵە لە دانی ئەو پارەیەی لەسەری ڕێک کەوتبوون. چونکە ئەو پارەیە ئەوەندە زۆر بوو کە شانی حکوومەتی فاتیمیی داهێزاندبوو، لەو دەمەشدا داراییی میسر دایە کزی و خەڵکە موسڵمانەکەی لە سیاسەتی دۆستایەتیی داگیرکەر تووڕە بوون. زۆری نەبرد سیاسەتی شاور کەوتەوە دژایەتیی خاچپەرستان و لە بوونیان بێزار بوو. بۆیە ناچار جارێکی تر داوای یارمەتیی لە سەروەری شام کرد، بەڵکو بێت خاچپەرستەکانی لەکۆڵ بکاتەوە. بۆ ئەم مەبەستەش (مەلیکول شوجاع)ی کوڕی ناردە لای نوورەدین مەحموود تا بەفریای بکەوێت و خۆشەویستیی خۆی بۆ سەروەر پێشان دا و گوتی ئامادەیە بە بەردەوامی باوەشی میسر بۆ سوپای شام بکاتەوە.

لە ڕاستیشدا خەلیفە، ئەل، پێش وەزیرەکەی هانای بۆ نوورەدین بردبوو "بێ هێزیی موسڵمانانی لە بەردەم فەڕەنگاندا باس کردبوو، چەند کەلاًفەیەک پرچی ژنانیشی بۆ خستبووە ناو نامەکان و پێی گوتبوو: "ئەمانە پرچی ژنانی کۆشکی خۆمە هاواریان بۆ تۆ هێناوە لە فەڕەنگان ڕزگاریان بکەیت"[٤٩].

بەو هیوایەی غیرەتی نوورەدین ببزوێنێت، چەند نامەیەکی تریشی بۆ نوورەدین مەحموود نارد و لە نامەکاندا نووسیبووی: "وا غوثاه! إلحق دين الاسلام، أدرك أمة محمد "صلعم" يا نورالدين يا نورالدين"[٥٠]. (واتە: ئەی هاوار، فریای دینی ئیسلام

---

٤٩. الكامل: ١١/٣٣٧.

٥٠. الدواداری "الدر المطلوب في أخبار ملوك بني أيوب"، چاپخانەی عیسی البابی الحلبی، قاهیرە ١٩٧٢، ل٣٠.

بكەوە، بە هانای ئوممەتی محەمەدەوە وەرە، ئەی ڕوناکیی دین و وەی نوورەدین).
جگە لەمەش بەڵێنی پێ دا کە سێیەکی دارایی میسری بداتێ، با شێرکۆش هەر لە میسر بمێنێتەوە[51].

میرانی خاچپەرست لەوە ترسان میسریان لەدەست بچێت و بکەوێتە دەستی نوورەدین مەحموود. بۆیە زۆر بەتوندی مەلیک ئەموریان هەڵپێچا هێرشێکی تر ڕێک بخاتەوە. ولیەم سوری مێژوونووسی ناسراوی خاچپەرست واتە Guilliaume de Tyre گێڕاویەتەوە کە مەلیکی قودس بە نابەدڵی بڕیاری ئەم هێرشەی دا و تا ئەو دەمە دەستبەرداری ئەو پەیمانە نەبوو کە لەگەڵ شاوردا بەستبووی[52].

دیارە مەلیک بەتەمای یاریدەی ئیمپراتۆری بیزەنتایی قوستەنتینییە بوو، لە کۆتادا بەخۆی و سوپایەوە بەڕێ کەت، هەر کە گەیشتە بلبیس، سەربازانی شاور ڕووبەڕوویان بوونەوە و دەرگایان بەڕوویاندا داخست. بەڵام هێرشبەران شارەکەیان گرت و خەڵکێکی زۆریان لێ کوشت و ماڵ و خانەیان وێران کردن. مێژوونووسی ناوبراو باسی دیمەنە دڵتەزێنەکانی کارەساتی بلبیس دەکات و دەڵێ: "خاچپەرستەکان بەشیرەوە بەزۆور کەوتن و هەر کەسیان تووش بووایە لە پیاو و ژن و پیر و منداڵ دەیانکوشت. پاشان هەڵیان کوتایە سەر ماڵان و ئەوەی خۆی تێدا مات دابوو کوشتیان و هەرچی بەردەستیان کەوت لە کەلپەل و شتومەک بەتاڵانیان برد[53].

لەو وەختەدا کە هێزی شالاوەکە لە قاهیرە نێزیک بووەوە، کەشتیگەلی خاچپەرستی ناو زەریەی ناوەراستیش گەیشتنە تەنیس[54]. بەڵام نەیانتوانی بەناو نیلدا شۆڕ ببنەوە بەهۆی ئەو کۆسپ و تەگەرانەی خەڵک لە ڕووبارەکەیان دانابوو. شاوری وەزیریش غیرەتی ئاینپەروەری و نیشتمانی _دوای ئەوەی کار لە کار ترازا- بزووت، لەلایەکەوە ئاگری لە فستات بەردا و لەلایەکی تریشەوە کۆمەڵێ

٥١. الكامل: ١١/٣٣٧-٣٣٨. الذهبي، العبر: ٤/١٨٢.

٥٢. لە: علی بيومی "قيام الدولة الأيوبية في مصر" وەرگیراوە، ل١٢٨-١٢٩.

٥٣. لە: علی بيومی، ل. ١٥٤ لەبارەی ئەم ڕووداوانە بڕوانە: ابن الأثير، الكامل، حوادث ٥٦٤، الروضتين: ١/١٥٤.

٥٤. تەنیس دورگەیەکە لە دەریای میسر، لە نێوان (فرما) و (دومیات) و لە وشکانییەوە نێزیکە. یاقوت، معجم البلدان ٢/٥١،

پارەی دا بە مەلیکی خاچپەرست بەڵکو قاهیرە داگیر نەکات. ئەم جارەش نوورەدین مەحموود نەیویست میسر بکەوێتە چنگی دوژمنەکەی، یان وەزیری میسر بە کەیفی خۆی یاری بە کاربارى بکات. "جارێک یاری بە ئێمە بکات و جارێک بە فەڕەنگان".

هەر کە بیستی ئەمووری چووەتە سەر میسر، نوورەدین مەحموود خێرا بەدوای شێرکۆیدا نارد کە لە حیمس بوو -حیمس بەو درابوو- لە ڕێگا نامەبەری نوورەدین بە شێرکۆ گەیشت، کە ئەویش دەیویست بچێتە حەلەب. کە لێیان پرسی خێرە دەچیتە حەلەب؟ وتی قاسیدێک لە شاورەوە هاتووەتە لای داوای لێ دەکات فریای میسر بکەوێت، بۆیە خێرا بۆ لای نوورەدین دەچێت تا بەرامبەر ئەم هەڵوێستە تازەیە بڕیارێک بدات. "نوورەدین سەرسام بوو، بەرچاوڕوونیی پێشان دا و سوپاسی کرد و فەرمانی پێ دا خێرا خۆی و سوپاکەی بۆ هێرشی میسر تەیار بکات، بۆ ئەمەش ٢٠٠ هەزار دیناری دایە، جگە لە تفاق و وڵاخ و ئامراز و چەک و ئەسبابی شەڕ، دەسەڵاتی تەواویشی دایە دەربارەی سەرباز و گەنجینە و سامان و ٨٠٠٠ سواری وەگەڵ خست کە چاکترین میرلەشکری نوورەدینیان لەگەڵدا بوو وەکو عیزەدین جوردی، غەرسەدین قلیج، عەینەدین بن یاروقی، شەهابەدین مەحموودی خاڵی سەلاحەدین، سەیفەدین عەلی هەکاری (بە مەشتووب ناسراوە)، خەسرەو کوڕی تەلیل و شەرەفەدین بەرغەش، سەرباری سەلاحەدین یوسف کوڕی ئەیووب. جگە لەوەش بۆ هەر سوارێک بیست دیناری دایە تا لە ڕێگا خەرجی بکەن[٥٥].

نوورەدین خۆیشی لەگەڵ شێرکۆ بەرەو دیمەشق کەوتە ڕێ و لەوێشەوە چوو بۆ ڕاسلمای و لەوێوە هێزەکانی بەرەو میسر بەڕێ خست، ئەمەش لە ناوەڕاستی ڕەبیعول ئەوەلی ٥٦٤ک/ کانوونی یەکەمی ١١٦٨ز بوو، خۆی و هێزێکی سوپایش لەو شوێنەدا دای کوتا و چاوەڕوانی مزگێنیی دەکرد. زۆری پێ نەچوو مزگێنیی پاشەکشەی خاچپەرستانی بۆ فەلەستین پێ گەیشت. ئەوجا نوورەدین فەرمانی دا بە بۆنەی سەرکەوتنەوە لە هەموو لایەک ئاهەنگ بگێڕن و نامەبەری بۆ هەموو لایەکی وڵات نارد[٥٦].

---

٥٥. الروضتين، ١/١٥٥.

٥٦. ابن الاثير، الكامل، ١١/٣٣٨-٣٣٩.

ئەگەرچی شێرکۆ لە دوو تەقەلاکەی پێشوودا، بە شێوەیەک لە شێوەیل، سەرنەکەوت لە سنووردانان بۆ چاوچنۆکیی خاچپەرستان، بەڵام سارد نەبوونەوەی لە کار و پلاندانان لە کۆتادا بە ئامانجی گەیاند، ڕزگارکردنی میسر سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ خۆی و بۆ پرسی ڕزگارکردنی خاکی عەرەبی ئیسلامی لە چەپۆکی داگیرکەرمیل. هەر بۆیە نوورەدین جگە لە شێرکۆ سەرکردەیەکی تری هەڵنەبژارد، سەرکردەیەکی دنیادیتەی لێهاتووی ئازای بەهرەدار، لەمە نوورەدین بەهەڵەدا نەچوو، لەوەش زیاتر باوەڕی زۆر پێی بوو، بە فەڕ و نوقڵانەی باشی دەبینی، چونکە هێشتا بۆ کارێکی نەناردبوو سەرنەکەوێ، مێژوونووسێکی گەورە دەڵی ڕووی نەکردبووە هیچ تەنگانەیەک و نەیکردبێتەوە[٥٧].

چونکە کە عیمادەدینی باوکی مرد، نوورەدین بە یاریدە و ڕاوێژی شێرکۆ حەلەبی گرت و بە یاریدەی ئەویش بوو کە ئەیووبی برای دیمەشقی گرت، بۆیە بریاری دا هەر بە پێی ڕای شێرکۆ هێرشەکانی بۆ سەر میسر ڕێک بخات[٥٨]. ئەوەی لێرەدا مایەی سەرنجە مێژوونووسەیل باسیان کردووە کە سەلاحەدین ڕازی نەبوو لەم هێرشەی دواییدا لەگەڵ مامی بچێت و بەشداری بکات، لێی دەگێڕنەوە گوتوویەتی: ئەم جارە پێم ناخۆش بوو بچمە شەڕ، بەئارەزووی خۆم نەبوو کە وەگەڵ مامم کەوتم. ئەمەش مانای دەقی فەرموودەی خوای گەورەیە "وعسى أن تكرهوا شيئا وهو خير لكم" کاتێ کە مامم گوتی: یوسف خۆت ڕێک بخە، هەر دەتگوت بە چەقۆ لە دڵمی دا. گوتم: مامە بەخوا ئەگەر موڵکی میسرم بدەنێ بۆی ناچم، لە ئیسکەندەرییە ئەوەندەم زەحمەت دیتووە کە هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە.

دوای ئەوەی سەلاحەدین لە بەجێهێنانی فەرمانی مامی دوودڵیی پێشان دا، مامی بە نوورەدین مەحموودی گوت دەبێ هەر لەگەڵم بێ، تۆ ئەمری پێ بکە، ئەمجا نوورەدین ئەمری پێ کردم، منیش لەگەڵی چووم[٥٩].

پێ دەچێ مەبەستی مێژوونووسان لە دەرخستنی بەرهەڵستیی سەلاحەدین بۆ بەشداری لە هەڵمەتەکەدا ئەوە بێ کە دەوری چارەنووس (قەدەر) یان (ڕێکەوت) لە

٥٧. ابو شامه، سەرچاوەی پێشتر، ١/١٦٦.

٥٨. علی بیومی، قیام الدوله الایوبیه، ل١٠٤.

٥٩. الكامل: ١١/٣٤٣.

کردەوە مەزنەکانی مێژوودا ڕوون بکەنەوە، چونکە، وا دەبێ یەکێک حەز ناکات کارێک بکات، پاشان بە نابەدڵی دەیکات و ئەو کارە ببێتە هۆی تۆمارکردنی ناوی لە بەرزترین پێگەیلی مێژوودا.

سەلاحەدین، وەکو ئیبن ئەسیر دەگێڕێتەوە- بەنابەدڵی چووە میسر بێ ئەوەی بزانێت قەدەر لای خۆی چیی بۆ حەشار داوە و کە لەوێوە دەبێت بە میراتگری خەلیفەی فاتیمی و نوورەدین مەحموود و لەسەر بناخەی دەوڵەتەکانیان دەوڵەتێکی مەزن دادەمەزرێنێ. ئەوە، گەورەیییە لە میسر کە چاوەڕوانی ئەوە[٦٠].

گەلی میسر بە هاتنی شێرکۆ و سەلاحەدین و سەرکردە و سەربازانی شام کەیفخۆش بوون، خەڵکەکە ئەوەندە شادمانییان پێشان دا کە ڕێی لە ئاواتی گلاوی شاور و هاوشێوەکانی بڕی کە کۆسپ بخەنە بەر پێشڕەویی مێژووی میسر و لە پەناوە خەنجەری تێ بژەنن. شاور کینە و ڕقی خۆی خواردەوە و بەردەوام دەچووە لای شێرکۆ بەو هیوایە لە خشتەی ببات لێی گەڕا بێت و بچێت تا کاتێک خۆی لێ دانووساند بیکوژێت، کە ڕۆژێک شێرکۆ و گەورە میرەکانی بۆ ئاهەنگێکی نانخواردن بانگ کرد تا هەموویان بە گردی لەناو ببات. مەلیک کامیلی کوڕی ئاگای لە پیلانەکەی باوکی بوو، زۆر ترسا و بڕیاری دا نەهێڵێ باوکی ئەو ناپاکییە بکات، بەلام شاور ڕاستگۆیانە پێی گوت: "بەخوا ئەگەر ئەمە نەکەین هەموومان دەکوژرێین" کوڕەکەشی وەلامی دایەوە: بابە، ڕاست دەبێژی. بەلام ئەگەر بە موسڵمانی بمرین و وڵاتی ئیسلام بە موسڵمانی بمێنێتەوە لەوە چاکترە بکوژرێین و وڵات ببێتە موڵکی فەڕەنگان[٦١].

پیاوەیلی شێرکۆ هەستیان بە مەترسداریی شاور کرد، بۆیە سەلاحەدین و

٦٠. بڕوانە: الغامدي "صلاح الدين والصليبيون"، کتێبخانەی الفیصلیة، مەکە ١٩٨٥، ل.٤٦ لەبارەی قەدەر و ڕۆڵیشی لە دروستکردنی ڕووداو، یان ئەوەی پێی دەگوترێ تیۆریی لووتی کلیۆپاترا، بڕوانە: ئێدوەر کار "ماهو التاریخ"، وەرگێڕانی احمد حمدی محمود، ل١٢٠-١٣٨. کارل پۆپەر "عقم المذهب التاریخي"، وەرگێڕانی عبدالحمید صبره، ل.١٢٧ احمد محمود صبحی "فی فلسفه التاریخ"، ل.٤٢ سیدنی هۆک "البطل في التاریخ"، وەرگێڕانی مەروان الجابری، ل١٥٨. عبدالحمید صدیقی "تفسیر التاریخ"، وەرگێڕانی کاظم الجوادي، ل١٥٨ و، گەلێ سەرچاوەی تریش.

٦١. الکامل: ١١/٣٣٩.

عیزەدین جۆرێک بڕیاریان دا لەکۆڵی بکەنەوە. ئیتر نێزیک گۆڕی ئیمامی شافیعی پەلاماریان دا و لە زەوییان کوتا و قۆڵبەستیان کرد و بردیان و هەواڵەکەیان بە شێرکۆ گەیاند.

هەر کە(عازید)یش هەواڵی گرتنی شاوری بیست داوای سەری کرد و پێی لەسەر داواکەی داگرت، پاشان شێرکۆ لە ڕەبیعول سانی ٥٦٤ک/ شوباتی١١٦٩ز، ئەرێی دا بۆ کوشتنی، خەڵکیش هێرشیان بردە سەر ماڵەکانی و تالانیان کردن. کوڕەکەشی لەگەڵ چەند هەڤاڵێکی لە کۆشکێکدا خۆیان قایم کرد، پاشان باسی نەما و زۆرتر وا پێ دەچێ پیاوانی کۆشک کوشتبێتیان. بەم جۆرە لاپەڕەی ئەو پیاوەی کە چارەنووسی خۆی و میسری بە چارەنووسی داگیرکەرانەوە بەست و میسرییەکان لە خراپە بەولاە هیچیان لێ نەدیت و دەیویست میسر هەرزان بفرۆشێت، هەتا هەتایە پێچرایەوە[٦٢].

خەلیفە عازید، لە جێی شاور، شێرکۆی کرد بە وەزیری دەوڵەت و ناوی نا (الملك المنصور الجيوش = مەلیکی سوپا سەرکەوتوو) و جڵەوی کاربار کەوتە دەستی. بەم جۆرە هێزی میسر چووە پاڵ هێزی نوورەدین مەحموود و ئەو یەکەتییە هاتە دی کە سەرکردە ڕزگارکەرەکانی خاکی عەرەب و ئیسلام لە چنگی خاچپەرستان، لە ماوەی پێشتردا، هەوڵیان بۆ دەدا. هەر لە شەرەفەدین مەودوود و ئەوانی دوای ئەوەوە بەتایبەتی عیمادەدین زەنگی و نوورەدینی کوڕی، تا دەگاتە شێرکۆ کە بەو سەرکەوتنە گەورەیە تاجی سەرکەوتنی لەسەر نا و ئەو خەونە گەورەیەی هێنایە دی کە لە پێناویدا غەزایان کرد. بەڵام مردن بواری بە شێرکۆ نەدا تا لەبەری سەکەوتنەکە بخوات، پاش دوو مانگ لە وەرگرتنی وەزارەت مرد و لە قاهیرە نێژرا، پاش ماوەیەکیش لاشەی ئەو و ئەیووبی برای گوێزرایەوە مەدینەی مونەوەرە و بەپێی وەسیەتی خۆیان لە تەکیەی خۆیان لە ماڵی (ئەبو ئەیووبی ئەنصاری)دا نێژران[٦٣].

٦٢. د. حسين مؤنس "نورالدين محمود"، چاپخانەی میسر ١٩٥٩، ل٣١٤.

٦٣. الروضتين، ١/ ٢٠٩، الحنبلي "شفاء القلوب"، ل٤٤.

## سەلاحەدین دەبێتە وەزیری خەلیفەی فاتیمی

پاش مەرگی شێرکۆ، خەلیفەی فاتیمی، سەلاحەدینی لەجێی مامی بە وەزیر دانا.

دیارە ئەم کارەش بێ بەرهەڵستی و ناحەزیی سەرکردەکانی نوورەدین مەحموود نەبوو، چونکە سوپاکەی شێرکۆ بەتەمای پایەی وەزارەت بوو. بەڵام خەلیفە سوور بوو لەسەر بەجێهێنانی وەسیەتی شێرکۆ و برازاکەی بە وەزیر دانا و نازناوی "الملك الناصر" سەلاحەدینی پێی دا و وای لێ هات ئەم نازناوە ناوی ڕاستەقینەی خۆی "یوسف کوڕی ئەیووب"ی بەتەواوی داپۆشی.

کوڕی ئەبو تەیی حەلەبی، کە مێژوونووسێکی گەورەی ئەو سەردەمەیە، دەڵێ: سەلاحەدین کەوتە بەر دڵی، ڕای لە ژیری و ڕای دروست و ئازایەتیی هەبوو، هەروەها شاگەشکەی دەستپێشکەریی ئەو بووبوو لە گرتنی شاوڕ و کوشتنیدا، بۆیە زوو وەزارەتی پێی دا و خۆشی ویست[٦٤].

بەڵام ئبن ئەسیر -کە هەڵوێستی دژی سەلاحەدینە- دەڵێ سەلاحەدینی هەڵبژارد لەبەر کەمتەمەنی و کەم شارەزایی لە کاروباری کارگێڕی و شەڕدا لەچاو سەرکردەکانی تری سوپا، بۆ ئەوەی دڵنیابێ کەوا لە فەرمانی ئەو دەرناچێت[٦٥].

ئەو میرەیلەی حەزیان نەکرد سەلاحەدین ببێتە وەزیر، بەتایبەتی عەینودەولەی یاروقی و عیزەدین جوردیک و ئەوانی تر، بە بەرهەڵست مانەوە، پاشان گەڕانەوە شام، بەڵام نوورەدین مەحموودی ئاغایان سەرکۆنەی کردن و گوتی نەدەبوو لەو کاتە ناسک و لەقەی مێژووی میسردا، کە بەتەواوی باری وڵات ڕێک نەخراوە، ئەو وەزیرە لاوە بەبێ پاڵپشت بەجێ بهێڵن[٦٦].

---

٦٤. الروضتين، ١/١٧٣.

٦٥. الكامل، ١١/ ٣٤٣، الباهر، ١٤٢.

٦٦. الروضتين، ١/ ١٦١، ابن كثير "البداية والنهاية"، چاپخانەی السعادة، قاهيرة ١٩٣٢، بەرگی ١٢، ل٢٥٧.

## قارەمانێکی ئەو سەردەمە سواری پشتی مەزناتی دەبێت

ئاخۆ ڕۆڵی پیاوی مەزن لە مێژوودا چییە؟

پیاوی مەزن تاکێکە، تاکی مەزنیش دیاردەیەکی گرینگی کۆمەڵایەتییە.

هەروەکو گیبون Gibbon لە کتێبەکەیدا "تێکچوون و ڕووخانی ئیمپراتۆری ڕۆمانی" دەڵێ زەمانە بۆ پیاوە نائاساییەکان خۆی دەگونجێنێ. پیاوی مەزنیش – هیگل دەڵێ– ئەو کەسەیە بتوانێ لە چەند وشەیەکدا ویستی (ئیرادە)ی سەردەمەکەی دابڕێژێت و بیانهێنێتە دی. ئەوەی ئەو دەیکا بریتییە لە کاکڵە (ماهیەت)ی سەردەمەکەی[٦٧].

لێرەدا نامانەوێ بچینە ناو گۆنگەڵی بیروڕای جیاواز لەبارەی قارەمان و کاریگەرییەکەیەوە لە ڕەوتی مێژوودا[٦٨].

هەروەها ناشمانەوێ باسی کردەوە چاکەکانی سەلاحەدین بکەین، یان شاگەشکە و واق وڕماو بین بەرامبەر پیاوێک بناخەی بوونی خاچپەرستەیلی هەڵتەکاند. بەڵام دەڵێن سەلاحەدین پیاوی ئەو زەمانە سەختە بوو، توانیی بە نەخشەکێشان و ڕێکیی ئامانجەکەی ساخی بکاتەوە، کە سەرکەوتن بەسەر دەستدرێژیدا بەبێ نەخشەکێشان و بەرچاو ڕوونی و هێزی خواست و ویست و گەڵاڵەکردنی هێزێکی تەواوی باوەڕدا بە مەسەلەی ڕزگاری پێک نایەت. چاکترین بەڵگەش بۆ ئازایەتی و جوامێریی پیاوەکە، شایەدیی مێژوونووسێکی لەشکرگەی دوژمنە، کە ولیەم سورییە و بەزمانی خۆی گوتوویەتی: سەلاحەدین پیاوێکی ژیر و

---

٦٧. ئیدوار کار "ما هو التاريخ"، ل. ٧٠ د. عبدالجليل الگاهر "مسيره المجتمع"، ل٤٢٥– ٤٧٠، سدنی هوک.

٦٨. احسان سرکيس "التأويل التاريخي ودور الفرد". پليخانۆف "محاضرات في تفسير التاريخ"، وەرگێڕانی جۆرج تەرابیشی. تۆماس کارلەیل "الابطال وعبادة البطولة"، وەرگێڕانی محمد السباعي.

له شەڕدا ئازا و تا ئەوپەڕی سنووری جوامێریش جوامێر بوو[٦٩].

باشــە، چی وای کــرد ئەم ســـەربازە بتــوانێ ئەم پێگە گــرینگە لە مــێــژوودا وەربگرێت؟

بەڵێ سـەلاحـەدین یوسف بوو بە وەزیری خـەلیفـەی فـاتیمی، نوێنەری نوورەدین مەحموود لە میسر، بۆیە لەسەر دراوی میسر پێش لەناوبردنی خیلافەت و مردنی دوا خەلیفە ناوی نوورەدین مەحموود لەتەک ناوی خەلیفەی فاتیمییەوە دەنووسرا. سـەلاحــەدین لە مـاوەی وەزیرایـەتیـیـەکـەیدا خـەریکی ڕێکخســتنی کـارگـێـڕیی ئاڵۆسکاوی دەوڵەت بـوو و هـات زۆرداریی لەســەر مـیـســرییــەلەوە هەڵگرت و ئەو باجـەیلەی سـووک کرد کە پشـتـیـانی کۆم کردبووە وە. لەم ڕووەوە چەند بڕیارێکی دەرکـرد و لەســەر مینبـەری مـزگـەوتان خـوێندرانەوە تا خـەڵک دڵنیـا بن. لەمــەوە دەردەکەوێ کاربەدەستان چ زەبر و زەنگێکیان لە کۆکردنەوەی باج و خەراج بەکار دەهێنا. بەو کـارە، ســەلاحــەدین دڵێ خـەڵکەکـەی بۆ خـۆی ڕاکـێـشـا و توانیی لە ماوەیەکی کەمدا کـارزانی و لێهاتوویی خۆی بۆ لەناوبردنی چەند جـوولانەوەیەکی یاخیگەرانـە بەکـار بهـێنێ کـە بەرهەڵسـتـانی بـوونی شـامـیـیـەکـان لە مـیـسـردا دروسـتـیـان کرد. ئـەمەشی بـەو هێزانە کرد کە نوورەدین مەحـمـوود لە شـامـەوە بە هیــمـــداد بـۆی ناردبـوو، کـــە تۆران شـــای بـرای، ســــەرکـــردەیان بـوو. یەکـــەم ڕووبەڕووبوونەوە کە تووشی سـەلاحەدینی حوکمـڕانی تازە بوو، یاخیـبـوونی هێـزە سـەربازە ڕەشپێستەکان بوون، ئەمەش کاتێ کە سەرۆکی کۆشکی شاهانە (مؤتمن الخـلافـة جـوهر) ڕقی لە ســەلاحــەدیـن هەڵگرت لەبەرئـەوەی خـۆی لەبەر دڵـی ئەهلی کۆشکدا ڕەزاگران بوو، پیلانێکی ڕێک خـست بۆ خـۆڕزگارکردن لە وەزیر. هەوڵی دا ئـەویش وەکــو شـــاوری وەزیری پـێــشـــوو لە بنەوە لـەگــەڵ ئـەمــووری مـــەلیکی خـاچپـەرسـتـەکـان ڕێک بـکـەوێت، بۆیە کـەوتە نامـە نووسـین بۆ ئەمـووری، کـاتێک نامەیەک لەو نامانە بەهۆی دەزگای تازە بنیاتی هەواڵگرییەوە بەدەست سەلاحەدین گـەیشت، وای بەچـاک زانی لە ڕەگـەوە ئاژاوەگـێـڕ و فـیـتـنەچی نەهێـڵێ و هەمـوو تەقـەلایەکی بە پێچ و پـەنا دژ بە دین و مــەســەلـەی ڕزگـاری وەکـو ئەوەی زرغـام و

---

٦٩. جب صلاح الدين، دراسات في التاريخ الاسلامي، ترجمة يوسف ايبش. بيروت ١٩٧٢. له (وليم الصوري) وەرگیراوە ل: ١٢٥.

شاور بەکاریان دەهێنا نەهێڵێ، بۆیە مؤتمن الخلافەی کوشت. پاشان هەموو نۆکەرە ڕەشپێستەکانی لە کۆشکی خەلیفایەتی دەرکرد و بەهادین قەرەقوشی کرد بە سەرپەرشتی کارباری کۆشکی خیلافەت.

بەڵام ئەمانە بەربەرەکانەی کردەوەی وەزیریان کرد و پێیان خۆش نەبوو لە کۆشک دوور بخرێنەوە و دەسەڵاتیان نەمێنێ، جا لە فستات کۆبوونەوە و هەندێ سەرچاوەش دەڵێن ژمارەیان گەیشتە زیاتر لە پەنجا هەزار کەس[70]، بۆ گەڕانەوەیان بۆ کۆشک و سەندنی تۆڵەی سەرۆکەکەیان شۆڕشیان کرد، سەلاحەدین هێزێکی بە سەرکردایەتیی (ئەبو هەیجا سەمین) ناردە سەریان و لەو شوێنەی کە بە (بین القصرین) ناسراوە لە قاهیرە بەسەریاندا زاڵ بوو، سەربازەکان ئاگریان لە ماڵەکانیان بەردا لە گەڕەکی (منصورە)[71]. پاش ئەوەش تۆران شای برای سەلاحەدین، تا سەعید ڕاوی نان، پاشان لە چەند تەقەلایەکی یاخیبووندا پەرت و بڵاوی کردنەوە[72].

خەلیفەی فاتیمی بە وردی دەیڕوانییە ڕووداوەیل و قسەی نەدەکرد، بەڵام نارەزاییی بەرامبەر کردەوەی سەلاحەدین و براکەی دەربڕی و ڕەشپێستەکانی ڕاسپارد نەبەزن و بەربەرەکانێ بکەن، بەڵام کە دیتی تای تەرازووی کێشەکە بۆ لای سەلاحەدین دەلەنگێ، هەڵوێستی گۆڕی و نوێنەری ناردە لای تۆران شا و پێی گوت: میری موسڵمانەیل سەلامت لێ دەکا و دەڵێ ئەو کۆیلە سەگانە لە وڵاتی خۆتان وەدەر نێن. کە ڕەشپێستەکانیش هەڵوێستی خەلیفەیان بەم جۆرە دیت ورەیان بەردا و بڵاوەیان لێ کرد[73].

هەروەها سەلاحەدین ڕەگەزەکانی تری ناو هێزی پاسەوانی خەلیفەشی نەهێشت، بەتایبەتی ئەرمەنەیل، لە جێی ئەوان سەربازی لایەنگری خۆی دانا. لە ئەنجامی ئەمەدا سەلاحەدین بە ئازاییەکی بێ وێنە توانیی بەر لە هێرشێکی

---

٧٠. العماد الكاتب الاصفهاني "سنا البرق الشامي"، کورتکردنەوەی البنداري، خانەی الكتاب الجديد، بەیرووت ١٩٧١، بەرگی ١، ل٨٣.

٧١. ابن قاضي شهبة "الكواكب الدرية"، ل. ١٨٥

٧٢. النجوم الزاهرة، ٥/٣٥٤.

٧٣. الروضتين، ١/١٧٨.

زەریەیی گەورە بگرێت لە دومیات کە بیزەنتییەل لەگەڵ خاچپەرستەیل ڕێکیان خستبوو پەنجا ڕۆژ گەمارۆی دومیاتیان دا. شەڕێکی گەورەش لە (نوبە) ڕووی دا[٧٤].

سەرەڕای ئەو گرژییە ماتەی لە نێوان سەلاحەدینی وەزیر و خەلیفەی فاتیمی رووی دا لە ئەنجامی پاکوەریی ڕەگەزەیلی سوپای فاتیمی، بەڵام خەلیفە پشتگیرییەکی ڕاستی سەلاحەدینی کرد لە تەقەلای لەناوبردنی کەشتیگەلی بیزەنتیدا، ئەوەبوو چەند جار پارە و تفاق و پێداویستیی بۆ وەزیر نارد. تەنانەت سەلاحەدین خۆی باسی کردووە: کەسم لەو چاوتێرتر نەدیوە لەو ماوەیەدا کە فەڕەنگەیل لە دومیات مانەوە هەزار هەزار (واتە ملیۆنێک) دیناری میسریی بۆم نارد جگە لە جلوبەرگ و شتی تر[٧٥].

بێگومان سەرنەکەوتنی ئەو هێرشە دوولاییەی خاچپەرست _بیزەنتی بووە هۆی پتەوبوونی پایەی سەلاحەدین لە میسر و وای کرد خیلافەتی فاتیمی بێ هیوا بێ لە دەرچوون لە دەنگی بێ هێز. نوورەدین مەحموودیش لە ڕێگەچارەیەک دەگەڕا کە پێوەندیی نێوان میسر و شام بەتین بکات. چونکە دەست بەسەرا گرتنی ڕێگە لەلایەن خاچپەرستانەوە، سەرباری قەڵاکانی سەر ڕێ، وەکو کەڕک و شۆبەک و هتد[٧٦] بووە هۆی ئەوەی دوژمن بتوانێ دەسەڵاتی بەسەر سەحرای نەقەبی نێوان زەریەی مردوو و زەریەی سووردا قایم بکات و مەسەلەی ڕزگارکردنی کەناراوی شام و خاکی فەلەستین کارێکی زەحمەت بێ. بۆیە نوورەدین مەحموود کەوتە پەلاماردانی ئەم ناوچەیە، سەلاحەدینیش کاتێک کە هەستی کرد دەتوانێ بجووڵێتەوە، ئەویش وای کرد. ئەوەبوو ساڵی ٥٦٦ک/ کانوونی دووەمی ١١٧٠ز پەلاماری قەڵاکانی خاچپەرستی دا لە فەلەستین. لە پێشەوە گەمارۆی قەڵای

٧٤. المقريزي، الخطط (چاپی پەیمانگەی فرەنسایی)، ٤٢/٥.

٧٥. الكامل، ٣٥٢/١١. النجوم الزاهرە، ٧/٦.

٧٦. کەڕک قەڵایەکی زۆر قایمە بە (صخرە الصحراء = بەردی بیابان) ناوی دەرکردبوو، دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی دەریای مردوو. شۆبەکیش قەڵایەکە لە باشووری کەڕک، هەردووکیشیان لەسەر ڕێی وشکانیی نێوان شام و میسر و لەسەر ڕێ حەجیشن.

داروم[77] دير البلح – خوارووى غەزەى دا، پاشان هەوڵى دا غەزەى داگيركراو بگرێت، بەڵام كۆششى سەلاحەدين سەرى نەگرت چونكە مەليك ئەموورييى قودس هێرشێكى سوپاييى بۆ بەرگرى لە كەناراوەيلى فەلەستين ڕێك خست و خۆى سەركردايەتيى كرد.

پاشان سەلاحەدين كە هەواڵى گەڕانەوەى مەليكى بۆ قودس زانى هێرشێكى بردە سەر ئيلە[78] (ئيلات لە فەلەستينى داگيركراو لەسەر كەنداوى عەقەبەيە) و لە زەريە و لە وشكانييەوە گەمارۆى دا و توانيى ڕزگارى بكات و دوژمنى لێ وەدەربنێت و هەرچيى تێدا بوو بەتاڵانى ببات و بگەڕێتەوە ميسر[79].

بەم كارەشى ڕێى زەريەى سوور و ڕێگاى حاجيەيلى ميسرى بەرەو حيجاز خستە دەستى خۆيەوە.

---

٧٧. داروم قەڵايەكە، ئەگەر لە ميسرەوە بێى، دەكەوێتە پاش غەزەوە. ياقوت الحموى، ٢/, ٤٢٤ ئێستا بە (دير البلح) دەناسرێ.

٧٨. ئيلە شارێكە دەكەوێتە سەر زەريەى قەلزەم (سوور) لە خوارووى شامە و گوتراوە كە ئيلە كۆتاى حيجاز و سەرەتاى شامە. ياقوت، ١/٢٩٢.

٧٩. مفرج الكروب، ١/١٩٨. ابن الفرات: مێژووەكەى. چاپخانەى حداد، بەسرا ١٩٦٧، بەشى ١، بەرگى ٤، ل١٢٦-١٢٧.

## کۆتاهێنان بە خیلافەتی فاتیمی

مانەوەی خیلافەتی فاتیمی بە کۆسپێک دادەنرا لە ڕێی هەوڵەکانی نوورەدین بۆ یەکخستنی بەرەی ئیسلام و ڕزگارکردنی خاکی عەرەب لە دوژمنی زەوتکەر، بۆیە دەبوو چارەسەرێکی یەکجارەکی بۆ دیاریکردنی باری حوکمی میسر بدۆزێتەوە.

سەلاحەدین ئەوەندەی سەرۆکەکەی سەرگەرمی لەناوبردنی خیلافەت و حوکمڕانیی دوولایی نەبوو لە میسردا. لەگەڵ ئەوەشدا و بەبەرچاوی خیلافەتەوە هەوڵی دەدا خواستەکەی نوورەدین بەجێ بگەیەنێ. لەبارەی خاوی و دوودڵیی سەلاحەدینەوە لە لابردنی خیلافەتدا، گوتراوە: "گوایا هەستی بە گۆڕانی هەست و هەڵوێستی نوورەدین بەرامبەر بەخۆی کردووە، دوای ئەوەی نوورەدین بەرگوێی کەوتووە کە سەلاحەدین دەیەوێ لە میسر سەربەخۆیی وەرگرێت. بۆیە سەلاحەدینی وەزیری میسری دەیەوێ خەلیفەی لەگەڵدا بێت، بۆ ئەوەی ئەگەر نوورەدین لێی ناڕازی بوو ئەو پشتی خۆی بە خەلیفە و گەلی میسر ببەستێ." ئەوەی ئەو ڕایەشی دەربڕیوە لەناو هەموو مێژوونووسەیلی سەردەمدا ئیبن ئەسیرە، کە بەوە ناسراوە سەرکۆنەی سەلاحەدین دەکات، بۆیە هەرچەند پلەیەکی بەرزیشی هەیە بەڵام بە ئاسانی گوێ بە ڕایەکەی نادەین[80].

ئەو کەسەیلەی ئەم ڕایە پەسند دەکەن، لایان وایە کە بەڕاستی سەلاحەدین لە لابردنی خیلافەتدا خاویی نواندووە[81]. بەڕای ئێمە هۆکاری ئەو بۆچوونەی ئەوانە ئەوەیە کە سەلاحەدین بەتەواوی حوکمی میسری کەوتبووە دەست و کاتێک

---

٨٠. الكامل، ١١/ ٣٦٨، الباهر، ١٥٦.

٨١. د. نظير حسان سعداوي "المؤرخون المعاصرون لصلاح الدين"، چاپخانەی لیژنەی البيان العربي، قاهیرە ١٩٦٢، بابەتی ئیبن ئەسیر. د. السيد الباز العريني "مؤرخو الحروب الصليبية"، خانەی النهضة العربية، قاهیرة ١٩٦١، بابەتی ئیبن ئەسیر. جب "صلاح الدين"، ل٨٤-٩٣.

سەلاحەدین بوو بە وەزیری فاتیمی، ئەو سەرکردەیە نەبوو کە پاشتر ناسیمان. ئەو ڕۆژەش دەزگەی کارگێڕی هێشتا بەدەست دار و دەستەی خیلافەت و لایەنگرانیەوە بوو، وەزیری گەنج پێی خۆی لە زەویی میسردا نەچەقاندبوو، دەیزانی کە یارمەتییەکانی نوورەدین بەئاسانی پێی ناگەن و ئەو بنکانەی لەسەر ڕێی میسر و شام هەن بەدەستی خاچپەرستی دوژمنەوەن. بۆیە لەناوبردنی خیلافەت بەو ئاسانییە نەبوو کە یەکێکی وەکو ئیبن ئەسیر تێی گەیشتووە و گوتوویەتی "دوو بزن شەڕە قۆچیان لەسەر نەدەکرد"[٨٢]. بگرە لایەنگرانی خیلافەت چەند جار و هەتا ئەو سالانەی دواییش هەولیان دەدا حوکم وەربگرنەوە، بۆ نمونە شۆڕشی کەنزول دەولە لە ئەسوانی سەعیدی میسر لە سەرەتای سالی ٥٧٠ک/ ١١٧٤ز[٨٣].

یەکەم جار، لە یەکەم هەینیی مانگی موحەرەمی سالی ٥٦٧ک/ ئەیلوولی ١١٧١ز، خوتبە بەناوی خەلیفەی فاتیمییەوە نەخوێندرایەوە، پیاوێک پێش خوتبەخوێن چووە سەر مینبەر و دوعای بۆ (المستضيء بأمر الله)ی عەباسی (٥٦٦-٥٧٥ک/ ١١٧٠-١١٧٩ز) کرد، لە هەینیی دووەمی ئەو مانگەدا سەلاحەدین فەرمانی دا خوتبەخوێنانی میسر چیی تر بەناوی عازیدەوە خوتبە نەخوێننەوە و دەبێ بەناوی (المستضيء)وە بێت. هەمووش گوێڕایەلی فەرمان بوون.

پێش ئەوەی خوتبە چی تر بەناوی عازیدەوە نەخوێندرێتەوە، عازید نەخۆش بوو، بۆیە نەیانهێشت هەوالەکە بزانێت، سەلاحەدین پیاوەیلی خۆی ڕاسپارد کە بەم هەوالە سەغلەتی نەکەن و گوتی: "ئەگەر لە نەخۆشییەکەی هەستایەوە ئەوە دەیزانێ، ئەگەر مردیش نابێ ئێمە پێش مردنی بەو هەوالە خورپەی بخەینە دلەوە

---

٨٢. ئیبن ئەسیر "الكامل"، ڕووداوەکانی ٥٦٧ک، ١١/٣٦٩.

٨٣. الكامل، ١١/٤١٤. ابن شداد "النوادر السلطانية"، ل٤٧-٤٨. بۆ ڕووداوەکانی (٥٧٢ک)، بڕوانە: المقريزي، الخطط، چاپخانەی پەیمانگە، بەرگی ٥، ل. ١١١ ئیبن ئەسیر، الكامل، ڕووداوەکانی (٥٨٤ک). هەروەها الروضتين، ٢/. ١٣٧ بۆ ڕووداوەکانی سالی ٥٨٨ک بڕوانە: المقريزي، السلوك، بەرگی ١، بەشی ١، ل. ١١١ بڕوانە د. محمد عمارە "عندما اصبحت مصر عربية"، دەزگای عارەبی بۆ لێکۆلینەوە و وەشاندن، بەیرووت ١٩٧٤.

ئەوەبوو ڕۆژی عاشووورا مرد بێ ئەوەی بزانێ کە خیلافەت و دەوڵەتەکەی نەماون[٨٤].

ئیبن ئەسیر باسی کردووە کە خەلیفە بەدوای سەلاحەدینیدا نارد بیبینێ، ئەویش لای وا بوو ئەمە فێڵە، کە مرد سەلاحەدین زانیی ڕاستگۆ بووە بۆیە لە نەچوونە لای پەشیمان بووەوە. ڕایەکیش هەیە دەڵێ سەلاحەدین لە بڕینی خوتبە بەناوی عازیدەوە پەشیمان بووەتەوە و گوتویەتی: خۆزگە ئارامم بگرتایە تا دەمرد"[٨٥].

هەواڵی میسر گەیشتە بەغدا، خەلیفەی عەباسی فەرمانی دا چەند ڕۆژێک بیکەنە ئاهەنگ و شار ڕازایەوە و بوو بە شادی و خۆشی[٨٦]، هەروەها خەلاتی بەدەست عیمادەدین سەندلی، یەکە پیاوی کۆشکی خیلافەت، بۆ سەروەری شام نوورەدین مەحموود نارد، هەروەها بۆ سەلاحەدین و خوتبەخوێنەیلی میسریشی نارد و ئالای ڕەشی دروشمی عەباسییەکاینشی لەگەڵدا نارد[٨٧].

ڕایەکیش هەیە دەڵێ خەلیفەی پێشووی عەباسی (المستنجد بالله) ٥٥٥-٥٦٦ک/ ١١٦٠-١١٧٠ز نامەی بۆ نوورەدین مەحموود نارد و گلەییی لێ کرد بۆچی لە خوتبەی میسردا ناوی ناهێنن؟ بۆیە نوورەدین مەحموود، میر ئەیووبی باوکی سەلاحەدینی نارده میسر و نامەیەکی پێدا نارد داوای لە وەزیری کوڕی کرد کە ویستی خەلیفەی عەباسی بەدی بهێنێ بەر لەوەی مردن هێرش بێنێ و وەختی نەمێنێ، بەتایبەتی کە ئیمامی سەردەم بەڕاستی ئەوەی دەوێ"[٨٨]. نوورەدین خۆی میر ئەیووبی بەڕێ کرد. لە میسریش خەلیفە خۆی -لە عادەتی خەلیفەیلی میسر بەدەر- بۆ پێشوازیکردنی چوو و نازناوی (مەلیک ئەفزەل نەجمەدین ئەیووب)یشی پێی دا و گەلێ دیاریی نایاب و بەنرخی بۆ نارد و لە تەنیشت ماڵەکەی خۆیدا خانوویەکی بۆ تەرخان کرد و ئیسکەندەرییە و دمیات و بحێرەشی دایێ[٨٩]. بەڵام

٨٤. الکامل، ١١/٣٦٩، مفرج الکروب، ١/٢١٨.

٨٥. النجوم الزاهره، ٥/٣٥٦.

٨٦. الزهبی، العبر، ٤/ ١٩٥.

٨٧. مفرج الکروب، ١/٢١٨.

٨٨. گێڕانەوەی ئیبن ئەبی تەی ئەلحەلەبی لە (الروضتین)، ١/١٨٣- ١٨٤.

٨٩. الروضتین، ١/ ١٨٤.

خیلافەتی فاتیمی لە سەردەمی موستەنجید لانەبرا و حەزەکەی بردە بن گڵ.

کاتێک سەلاحەدین بە باوکی گەیشت زۆر بە گەرمی پێشوازیی لێ کرد، پاشان وەزارەتی میسری پێشکێش کرد، بەڵام قبووڵی نەکرد و پێی گوت: "کوڕی خۆم، خوا تۆی بۆ ئەم پلەیە هەڵبژاردووە چونکە تۆ شایانی ئەوەی. نابێ ئێمە بیگۆڕین"[90]. ئینجا سەلاحەدین کردی بە سەرپەرەوەری هەڵسووڕاندنی دارایی دەوڵەت و کردی بە ڕاوێژکاری یەکەمی خۆی.

باری میسر هێور بوو و سەلاحەدین توانیی هێزێکی سەربازیی لایەنگری خۆی دابمەزرێنێ و بەرهەڵستەیلی نەهێڵێ، پاشان هێزێکی ناردە سەر وڵاتی نۆبە و خستیە سەر حوکمڕانیی خۆی و شەمسول دەولە تۆران شای برای کردە سەروەری ئەوێ و پاشان هێزێکی تری بە سەرکردایەتیی ئەو برایەی لە ٥٦٩ک/ ١١٧٣زدا ناردە سەر یەمەن، وڵاتی یەمەنیش بوو بە بەشێک لە دەوڵەتی ئەیووبی لە میسر.

سەلاحەدین سەرکردایەتیی هێزێکی سوپای کرد و بەرەو قەڵای کەرک چوو تا گەمارۆی بدات و بیگرێ بە مەرجێک نورەدین لە باکورەوە هێرشی بۆ بێنێ، بەڵام هێرشەکە سەرنەکەوت چونکە سەلاحەدین لە ئەسپ کەوت و ناچار بوو بگەڕێتەوە میسر، لەوەش ترسا نەوەک ئاژاوە لە میسر پەیدا بێت کەوا باوکی لە جێی خۆی دانابوو. پاشان قازی عیسا هەکاریی ناردە لای نوورەدین مەحموود داوای لێبوردنی لێ کرد کە کشاوەتەوە بەرەو میسر، ئەویش بە پەیامبەرەکەی سەلاحەدینی گوت: "پاراستنی میسر لای ئێمە لە شتی تر گرینگترە"[91].

سەلاحەدین لەم کاتەدا زانیاریگەلی مەترسیداری دەس کەوت، کە لایەنگرەیلی خیلافەتی فاتیمی بە هاوکاریی ئەمووریی مەلیکی خاچپەرست، کە بە ئاواتی داگیرکردنی میسرەوە بوو، هەروەها بە هاوکاریی ولیەمی دووەمی مەلیکی نۆرمانی سەقلیە و تاقمی ئیسماعیلییەلی شام بە سەرۆکایەتیی سینانی شەیخول جەبەل پیلانێکیان ڕێک خستبوو[92]. پیلانگێڕەیل لە میسر گیران و کران بەدارا.

---

٩٠. هەمان سەرچاوە، ل١٨٣.

٩١. الکامل، ١١/٣٩٣.

٩٢. عمارە الیمنی، نووسەری "النکت العصریة في اخبار الوزارات المصرية"، چاپی فەرەنسا ١٨٩٧.

عەمماری یەمەنیی شاعیر و نووسەر کە بە چەند هەڵبەستێک مەدحی سەلاحەدینی کردبوو، عەبدلسەمەدی نووسەر و قازی ئەلعویرس و داعیل دوعات و کۆمەڵێک لە پیاوەیلی سەردەمی پێشوو و دەست و پێوەندی کۆشک و نۆکەرە ڕەشپێستەکانیان لە پیلانەکەدا بەشدار بوون[٩٣].

پەردەلادان لەسەر ئەو پیلانە بەترسە، هێز و وریاییی هەواڵگریی سەلاحەدینی پێشان دا و لە ئەنجامدا ئەندامانی بنەماڵەی عازید و فاتیمییەکان لە کار دوورخرانەوە خرانە ژێر چاوەوە و ڕێگەیان لێ گیرا بچنە کن ژنەکانیان، جگە لە کورە مێردمنداڵەکەی عازید[٩٤].

مەلیکی سەقلیەش نەیزانی لە میسر چی ڕووی داوە بۆیە کەشتیگەلی خۆی لێ خوری کە پێک هاتبوو لە ٢٠٠ (شینی) واتا کەشتیی گەورەی سواری و ٣٦ (تەڕیدە) واتا کەشتیی گەورەی تایبەت بە هەڵگرتنی وڵاخ و ٦ کەشتیی گەورەش کەرەستەی شەڕیان هەڵگرتبوو. شەڕکەرەیلی ئەم هێرشە ٥٠ هەزار پیادە و ١٥٠٠ سوار بە سەرکردایەتیی ئامۆزای مەلیکی سەقلیە گەیشتنە ئیسکەندەرییە[٩٥]. گەلی ئیسکەندەرییە ئازایانە بەرگرییان لە شار و وڵات کرد، کاتێکیش سەلاحەدین گەیشتە شار، شەڕکەرەیل بە جارێ سەرگەرمی شەڕ بوون و "هەرچی ماندوویی و ئێشی برینیان هەبوو هەموویان لە بیر کرد، هەر یەکێک وای دەزانی سەلاحەدینی لەگەڵە بۆیە وای شەڕ دەکرد وەکو بڵێی سەلاحەدین چاوی لێیەتی"[٩٦].

شەڕێکی وایان کرد شەڕکەرانی سەقلیەیان بەزاند، ئەوەی کوژرا کوژرا و ئەوەی بریندار بوو بریندار بوو و ئەوەی خنکا خنکا و ئەوەی بەدیل گیرا بەدیل گیرا، هەندێکیشیان بەپەلە ڕایان کرد، ئەمە سەرەتای ساڵی ٥٧٠ک/ ١١٧٤ز بوو، بەم شێوەیە ئاواتی ئەوان و لایەنگرانیانی لەناو برد، ئیتر جارێکی تر بیریان لەوە نەکردەوە بێنەوە میسر تا لەدەست سەرکردەیەکی وا بەهێزدا بێت. هەرچی

---

٩٣. سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨٧ و٢٩١ و٣٠١.

٩٤. مفرج الكروب، ١/٢٤٧.

٩٥. العماد الكاتب "سنا البرق الشامي"، ساخكردنەوەی ڕەمەزان شەشەن، خانەی کتێبی نوێ، بەیرووت ١٩٧١، بەرگی یەکەم، ل. ١٦٩

٩٦. الكامل، ١١/٤١٣. الروضتين، ١/٢٣٤. مفرج الكروب، ٢/١٢-١٣.

ئەمووریی مەلیکی خاچپەرستیشە پێش جێبەجێکردنی پیلانەکەی نامەبەرێکی خۆی ناردە قاهیرە، لە ڕوواڵەتدا سڵاوی مەلیکی بۆ سەلاحەدین پێ بوو. لە ڕاستیشدا بۆیە هاتبوو نەخشەی پیلانەکە و پێداویستیەکانی لەگەڵ پیلانگێڕمیلدا ڕێک بخات. بەڵام کاتێ دەنگوباسی شکانی هەوڵەکەی زانی گەڕایەوە قودس و بەوپەڕی هیوا ڕووخاوییەوە پاش ماوەیەکی کەم مرد.

بەم جۆرە سەلاحەدین کە هەرا و ئاژاوەی ناوخۆی لەناو برد و بەرپەرچی دەستدرێژییەکەی سەقلیەی (نورمانی) و هاوپەیمانەیلی دا، توانیی لە کێشەیلی ناوخۆ ڕزگاری بێت و دەسەڵاتی خۆی لە وڵاتی میسر پتەو بکات. ئیتر هیچی نەما ئەوە نەبێ بۆ ئامانجە گەورەکە خۆی تەرخان بکات واتە ڕزگارکردنی خاکی فەلەستین و شام لە شەڕی داگیرکەران شان بەشانی نوورەدین مەحموودی ئاغای. بەڵام لەو دەمەدا ڕووداوێکی گەورە قەوما کە تا ماوەیەک مەسەلەی ڕزگارکردنەکە و پتەوکردنی یەکەتیی نێوان میسر و شام و جەزیرەی فوراتی دواخست.

## مردنی نوورەدین مەحموود

نوورەدین بە نەخۆشی (الخوانیق و الحمی = ڕەنگە گەروەخرا بێت) لە ١١ی شەوالی ٥٦٩ک/ ١٥ی مایسی ١١٧٤ز لە ماڵی خۆی لە قەڵای دیمەشق کۆچی دوایی کرد و کوڕێکی ڕواڵی بەناوی "ئیسماعیل مەلیکی ساڵح" لەپاش بەجێ ما. خەم هەموو خەڵکی شام و جزیرە و میسری داگرت، پیاو و ژن بۆ بەڕێکردنی تەرمی ئەو قارەمانە مەزنە لە دیمەشق هاتنە دەرێ.

## سەلاحەدین لە شام

لە ڕاستیدا ئەگەر سەلاحەدین خۆی لە کاروباری ولاتی شام نەگەیاندایە، ولاتەکەی مولکی نوورەدین مەحموود دەبووە چەند ناوچەیەکی بچووک و هەر ناوچەیەکیش میرێک بەسەریەوە دەبوو و ئەو دەمە لە تواندا نەدەبوو سینگ بدەنە بەر خاچپەرستەیل و بەرهەلستییان بکەن. ئەم ڕێبازەش پاش مردنی نوورەدین مەحموود بەرە بەرە ڕوون و ئاشکرا دەبوو[97].

سەلاحەدین پاش دلنیاییەکی تەواو بە پێویستیی جوولانەوە، بە خۆی و سوپاوە لە سەرەتای مانگی سەفەری سالی ٥٧٠ک/ سەرەتای ئەیلوولی ١١٧٤ز بەڕێ کەوت، هێزێکی ٧٠٠ سواری لەگەلدا بوو، سەرباری ناوبانگی زۆری ئازایەتی و مەردایەتی و سەرکەوتوویشی[98].

بە هەر شارێکی میسردا تێپەڕ دەبوو خەلک بە خۆشی و پشتگیرییەوە پێشوازییان دەکرد و لە هەر جێیەک دای دەکوتا، هیمدادی پێ دەگەیشت، میر و گەورە پیاوانی شاران بە پیریەوە دەچوون، لەوانە شەمسەدین سدیق کوڕی جاولی حوکمڕانی بوسڕا، ناصرالدین محمد کوڕی شێرکۆی مامی، میر سەعدەدین کوڕی موعینەدینی والیی پێشووی دیمەشق، هەروەها نوێنەرەیلی ئیبن موقەدەم، سەرباز و سوپایەلی دیمەشقیش خۆیان دەگەیاندێ[99].

سەلاحەدین هاتە ناو دیمەشق و هیچ دەرگایەک بەڕوویدا دانەخرا و زۆر باش بەخێر هێنرا، هەروەکو شار شاری خۆی بێت، لەوێش چووە خانووەکەی باوکی کە بە (دار العقیقی) ناسرابوو، شەوەکەی لەوێ بەسەربرد، بۆ سبەینێ ئبن موقەدەم دەرگەکانی قەلای دیمەشقی بۆ کردەوە و کلیلەکانی دایە.

---

٩٧. علی بیومی "قیام الدوله الایوبیه فی مصر"، ل٢١٢.

٩٨. ابن واصل، مفرج الکروب، ٢/١٩.

٩٩. الروضتین، ١/٢٣٦، مفرج الکروب، ٢/١٩.

سەلاحەدین، سەیفولئیسلام توغتەکینی برای کردە لێپرسراوی قەلاکە. پاشان فەرمانی دا (مکوس = باج) هەڵبگرێ و ئەو ڕەفتارە حەرام و ناڕەوایانەی دوای نوورەدین مەحموود دەرکەوتن نەمێنن، خەڵک بەو کارانە دڵخۆش بوون و شاعیران بە هەڵبەستی جوان پەسنیان کرد، لە هەموو بۆنەیەک و لە هەموو کۆڕ و دانیشتنێکدا دووپاتی دەکردەوە کە هەر لە ژێر فەرمانی کوڕەکەی نوورەدین مەحموودە و بۆ ئەوە هاتووەتە شام تا مافەیلی ئەو کوڕە و یەکەتیی وڵات بپارێزێت و لە تەماعی فەرمنگەیل ڕزگاری بکات، هەروەها خوتبەی هەینی و سکە و دراویشی هەر بەناوی (مەلیکی سالح)ەوە هێشتەوە بۆیە خەڵک ڕێزیان گرت و توانیی دڵی خەڵکی هەمەجۆر بۆ لای خۆی ڕابکێشێت. پاشان بڕیاری دا سزای مشتەکینی حەلەب بدات چونکە مەلیکی ڕفاندووەتە ئەوێ و بە بیانووی پارێزگاریی مافەکانی دەستبەسەری کرد. چەند نامەیەکیشی بۆ میسر نارد، باسی ئەوەی کرد کە خوا بۆ ئەم فەتحە سەری خستووە[١٠٠].

پاشان بەرەو باکور کەوتە ڕێ و شاری حیمسی گرت، بەلام قەلاکە لێی یاخی بوو، تیپێکی سوپاکەی لەوێ بەجێ هێشت، گەمارۆیان دا و خۆشی چووە حەما، ئەم دوو شارە و چەند شارێکی تریش مولکی فەخرەدین مەسعوود کوڕی زەعفەرانی بوون. حوکمڕانی حەما، میر عیزەدین جوردیک، هەر کە زانیی مەبەستی سەلاحەدین لەم هێرشە چییە و دڵنیا بوو کە بۆ دامەزراندنەوەی دەوڵەتی نوورەدین مەحموود و پاراستنی مافی کوڕەکەی هەوڵ دەدات قەلاکەی تەسلیم کرد و خۆی بوو بە یەکێک لە پیاوەیلی سەلاحەدین. ئەوەی شایانی باسە عیزەدین جوردیک ئەو کەسە بوو کە لەگەڵ سەلاحەدین پێکەوە شاوری وەزیری بەدکاریان کوشت. سەلاحەدین چاوەڕوانی چاکەی لێ دەکرد، بۆیە کردییە نوێنەری خۆی و ناردیە حەلەب بۆ ئەوەی ئیبن دایە و برایەلی ئەو لە گرتووخانە ئازاد بکا. بەلام هەر کە نوێنەری سەلاحەدین گەیشتە حەلەب، سەعدەدین کەمشتەکین گورج لە گرتیگەی قایم کرد.

سەلاحەدین بەرەو باکور هەڵکشا بۆ ئەوەی حەلەب بگرێت، لە ٣ی جومادی ئولا ٥٧٠ک/ کۆتایەلی ١١٧٤ز گەیشتە ئەوێ، بەلام شار دەرگەی لە ڕووی داخست و

---

١٠٠. الروضتین، هەمان لاپەڕە. مفرج الکروب، ٢/٢٠.

خۆی بەدەستەوە نەدا. بە فیتی کەمشتەکین، مەلیکی ساڵح هەست و سۆزی شەرکەرەیل و خەڵکی دژی سەلاحەدین دەبزواند، جارێکیان پێی گوتن: سەلاحەدین پیاوێکی بێ ئەمەکە بەرامبەر بە باوکی و هاتووە شارەکەی لێ داگیر بکات و لە خوا ناترسێت. دەستی بە گریان کرد و خەڵکەکەشی هێنایە گریان و دڵگەرمانە کەوتنە بەرگری.

گەمارۆی شار بەتینتر بوو، کاتێک کەمشتەکین زانیی کە ناتوانێ ماوەیەکی زۆر خۆی بگرێت داوای یارمەتیی لە سینان ڕاشیدەدینی سەرۆکی تایەفەی ئیسماعیلی (باتنییەکان) کرد[١٠١]. هەروەها هاناشی بۆ ڕیمۆندی سێیەمی میری تەرابلوس برد کە وەختی خۆی نوورەدین چەند ساڵ دیل و داو کردبوو، کاتێ کەمشتەکین پاش مردنی ئاغای، کاری حەلەبی گرتە دەست بەرەڵلای کرد. سینانیش زۆری پێ نەچوو دەستەیەک پیاوکوژی گیانفیدای ناردە ناو خێوەتگەی سولاحەدین و خەریکی بەجێهێنانی پیلانەکەیان بوون، لەوێدا ناسران، دوای ئەوەی چەند سەرباز و پاسەوانێکی سەلاحەدینیان کوشت، بەتەواوی لەناو بران. پاش ئەمە کاربەدەستانی حەلەب قاسیدیان ناردە لای ڕیمۆندی باسکراو بەڵکو ئەگەر یاریدەیان بدات حەلەب لە گەمارۆکە ڕزگار بکات پارەیەکی زۆری دەدەنێ. ئیبن ئەسیر باس دەکا کە میرەیلی حەلەب داوایان لە میری تەرابلوس کرد پەلاماری بنکەیلی بەر دەستی سەلاحەدین بدات بەڵکو ناچار بێت گەمارۆ لەسەر حەلەب هەڵبگرێت[١٠٢]. ڕیمۆندی سێیەم (کە سەرپەرەوەری عەرشی مەملەکەتی قودسیش بوو) دەیزانی هاوپەیمانیی خاچپەرستان لەگەڵ حەلەب کارێکی گرینگە و لەوەش ئاگەدار بوو کە یەکێتییەکی ئیسلامی لە نێوان قاهیرە و دیمەشق و حەلەبدا مایەی مەترسییە. بۆیە سوپای دەرکرد بۆ فریاکەوتنی حەلەب و خۆی بە پارێزگاری مەلیکی ساڵح ئیسماعیل پیشان دا(!) ئەمەش بێگومان کارێکی بێ پەردە بوو. ولیەم سوریی مێژوونووسی خاچپەرستی هاوچەرخ دەڵێ: ڕیمۆندی سێیەم کە ئەم کارەی کرد نە بۆ خۆشەویستیی مەلیکی ساڵح و نە بۆ چاکەی

---

١٠١. لەبارەی ئەم ڕووداوەوە، یان پێوەندیی نێوان سەلاحەدین و سینان ڕاشیدەدین سەرۆکی ئیسماعیلییەل، بڕوانە کتێبی: مصطفى غالب "سنان راشدالدين شيخ الجبل الثالث"، بڵاوکراوەی خانەی اليقظه العربيه ومنشورات احمد، بەیرووت ,١٩٦٧

١٠٢. الكامل، ڕووداوەکانی ٥٧٠ک. الروضتين، ١/ ,٢٤٠

حەلەب و میر و خەڵکەکەی بوو، بەڵکو بۆ بەربەرەکانەی سەلاحەدین و ڕێبەستن بوو لە یەکەتی دژ بەخۆی. بە واتایەکی تر خاچپەرستەیل زانییان کە سەربەخۆیی حەلەب و مانەوەی لە دەرەوەی دەسەلاتی سەلاحەدین چاکترین ڕێگرە لە دروستبوونی یەکەتییەکی ئیسلامی لە نیلەوە تا فورات. بۆیە ڕیمۆند کەوتە بەکارهێنانی دیپلۆماسیەت و وتووێژ لەگەڵ سەلاحەدین لەبارەی پاشەڕۆژی حەلەبەوە(!) قاسیدی ناردە لای بۆ ئاشتی و وای پیشان دا "فەرەنگەیل یەکیان گرتووە و یەکدەست و بەهێزن". بەلام سەلاحەدین قبووڵی نەکرد لەبارەی چارەنووسی حەلەبەوە، بە هەر نرخێک بێت وتووێژ بکات، یان لەسەر چەند دەستکەوتێکی بێ بەها پێک بێن، بۆیە بە قسەی سەروەری تەرابلوسی نەکرد و وتی: "من لەوانە نیم لە زەبری فەرەنگان بترسم". پاشان بەشێکی سوپاکەی ناردە سەر ئەنتاکیا و تالانییەکی باشیان هێنا و گەڕانەوە[١٠٣]. لەو دەمەشدا ڕیمۆندی سێیەم خێرا سوپای ناردە سەر حیمس تا بە بێ ئاگای سەلاحەدین بیگرێت. بەلام کە سەلاحەدین پێی زانی دەوری حەلەبی بەر دا و بەپەلە چوو بۆ بەرەنگاریی دوژمن ئەوسا ڕیمۆند حیمسی بەجێ هێشت و مایەپووچ بۆی دەرچوو، نەیویست یەخەگیری سەلاحەدین بێت.

سەرکردە بۆ ماوەیەک وازی لە حەلەب هێنا و گەڕایەوە دیمەشق لە ڕێگەشدا شاری بەعەلبەکی لە دەشتی بیقاع گرت، کە بیرەوەریی ڕۆژانی منداڵیی لە باخ و دەشتە سەوزەکانیدا زۆر بوو. کەمشتەکینی حوکمڕانی حەلەبی هاوپەیمانی دوژمن، بۆ سوپاسی هاوپەیمانەیل دیلە خاچپەرستەیلەکەی سەردەمی نوورەدین مەحموودی بەرەلا کرد، سەردەستەی ئەوانەش سواری خاچپەرست "ڕینو دی شاتیون" بوو کە لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا بە "ئەرنات" ناسراوە و یەکێکە لە خاچپەرستە خوێنڕێژ و دوژمن بە موسڵمانان هەروەکو لە مەودا دەیبینین. کەمشتەکین و لایەنگرەیلی وی لە حەلەب سەیریان کرد سەلاحەدین تا دێت بەهێزتر دەبێت و لە وڵاتی شام دەسەلات پەیدا دەکات، سەرەنجام ترسان، بۆیە لەگەڵ سەیفەدین غازی سەروەری موسڵ ڕێک کەوتن کە بە دوو قۆڵی پەلاماری دیمەشق بدەن. ئەوەبوو ژمارەیەکی زۆر بەرەو شار شالاویان هێنا. سەلاحەدین

١٠٣. الروضتين، ١/٢٣٩.

قـاسـیـدی نارده لایان، ئامـۆژگـاریی کـردن کـه نـه‌بنه هـۆی ڕشـتنی خـوێنی موسڵمـانه‌یل و له ده‌ستدرێژیی فـه‌ڕه‌نگه‌یل وریای کردنه‌وه و داوای ئاشـتیی لێ کـردن، گوتی کـه هـه‌مـوو شـاره‌یلی شـامـیـان ده‌داته‌وه کـه گرتوونـی ئه‌گه‌ر خـۆی سه‌رپه‌روه‌ریی مه‌لیکی سـاڵح ئیسمـاعیل بکـات و ببێته نوێنه‌ری ئه‌و له دیمه‌شقدا. به‌لام سه‌رکرده‌یلی سوپای حه‌له‌ب و موسڵ به‌ده‌ست پێشکه‌رییه‌که‌ی سه‌لاحه‌دین ڕازی نه‌بوون و گوتیان ئاشتی نابێت هه‌تا هه‌رچی له شام گرتوویه‌تی نه‌یداوه‌ته‌وه و ته‌نیا میسر بۆ ئه‌و بێت و له‌کوێ هاتووه با بگه‌ڕێته‌وه ئه‌وێ و هیچ مافێکی له دیمه‌شقدا نه‌مێنێت.

سـه‌لاحـه‌دین کـه ئه‌مـه‌ی دیت فـه‌رمـانی به میرله‌شکره‌یلی خۆی دا خـۆیان سـاز بده‌ن و به‌ره‌نگاریی هێـرشکه‌ران بکه‌ن. سـوپاکـه‌شـی له دیمه‌شـقـه‌وه به‌ره‌و باکـور به‌ڕێ خـست و له نێـزیک حـه‌مـا تووشـیـان هات و له ڕه‌مـه‌زانی ٥٧٠ک/ نیسـانی ١١٧٥ز به لێـدانێکی پشـتـشـکێن به‌زانـدنی و به‌سـه‌ریاندا زاڵ بوو، وا بـه‌زین برا ئاگـای له برا نه‌مـا و ڕایان کـرد و سـه‌لاحـه‌دین به‌دوایانـه‌وه تفـاق و ئه‌سـپـاب و ولاخـه‌کـانیـانی بۆ ده‌مـایه‌وه و هه‌تا حـه‌له‌ب خـۆیان نه‌گرته‌وه. سـه‌یفـه‌دین غـازیش گه‌ڕاوه موسڵ، خـۆی بۆ شـه‌ڕێکی دی سـاز دا، چونکه ده‌یزانی سـه‌لاحه‌دین له ناو مـاڵی خـۆیدا به‌سـه‌ریدا ده‌دا، که وابێ چاکتـر وایه ئه‌و ده‌سـتـپـێشکه‌ری بکات له هێرشدا. بۆ ئه‌م مـه‌به‌سته‌ش سوپایه‌کی له ٦٠٠٠ شـه‌ڕکه‌ر پێک هێنا و له جێیه‌ک کـه پێی ده‌ڵێن "تل السلطان" به‌ره‌نگاری سـوپاس سـه‌لاحـه‌دین بوو. سـه‌ربازانی سه‌لاحه‌دین توانییان سوپای غازی تێک بشکێنن و هه‌رچی گه‌نجینه و چه‌ک و ولاخ و ئازووخـه‌ی هـه‌بوو هه‌مـوویان به‌تالان بـرد و ژماره‌یـه‌کی زۆریش سـه‌ربازیان به‌دیل گرت و ئه‌وانه‌ی تر ڕایان کرد[١٠٤].

سه‌لاحـه‌دین ڕووانیی هێشته وه‌ختی گه‌مارۆدانی حـه‌له‌ب نه‌هاتووه، بۆیه بنکه و شوێنه نێزیکه‌کانی ده‌ورووبه‌ری گرت وه‌کو بزاغه، مه‌نبه‌ج، عزاز.

له کاتی گه‌مارۆدانی عزازدا چوار که‌س له ئیسماعیلییه‌ل جلوبه‌رگی سه‌ربازانی سه‌لاحه‌دینیان له‌به‌ر کرد و به‌ناوی سه‌لاحه‌دین ئازایانه شه‌ڕیان ده‌کرد و توانییان به‌ته‌واوی گومان له‌سه‌ر خـۆیان لا ببه‌ن، ڕۆژێک که سه‌لاحه‌دین له خێوه‌تی میرێک

---

١٠٤. الروضتین، ١/ ٢٥٥، مفرج الکروب، ٢/٤٠.

لە میرەکانی بوو، یەکێک لەو ئیسماعیلییانە خۆی هەڵدایە سەر سەری و چەقۆی بۆ ڕاوەشاند تا لەسەری بکوتێ، بەڵام هەر بەر "زمردی"یەکەی کەوت کە هەمیشە لەبەری بوو (زمردیە: بەرگێکی لە ئاسن دروست کراوە لە بن جلوبەرگی خۆی لەبەری دەکرد). ئەمجا چەقۆیەل هیچ کاریان لە لەشی نەکرد. کە ئیسماعیلییەکە دیتی سەلاحەدین ئاسنی لەسەر ناوە چەقۆیەکی حەواڵەی کۆڵمەی کرد بەڵام هەر کەمێکی داڕوشاند چونکە سەلاحەدین لێی ڕاپەڕی و توند سەری گرت و ڕای کێشا و بە زەوییدا دا ئەوسا سەربازەیل کوشتیان. دوای ئەمە سێ ئیسماعیلییەکەی تر هەڵیان کوتایە سەر چادرەکە و هەر یەکە دەیویست سەلاحەدین بکوژێت. بەڵام سەربازەیل ئەوانیشیان کوشت[١٠٥].

دەنگۆ وا بڵاو بووەوە گوایە سەلاحەدین کوژراوە. بەڵام قازی ئەلفازیل – عەبدولڕەحیم بیسانی– نووسەر و ڕاوێژکاری /بەناوبانگی/ سەلاحەدین نامەیەکی بۆ مەلیکی عادل سەیفەدین ئەبو بەکری برای سەلاحەدین نارد و ڕاستیی ڕووداوەکەی بۆ ڕوون کردەوە و لە نامەکەدا نووسیی ئەلحەمدولیلا سەلاحەدین سەلامەتە و لە چەند دڵۆپە خوێنێ بەولاوە هیچی تری لێ نەهاتووە و گەمارۆدانی عەزازیش بەردەوامە.

لە ئەنجامی ئەو پیلانە نامەردانەیەی هاوپەیمانانی سەعدەدین کەمشتەکێن نایانەوە و بەو پێیە کە ئەمە حوکمڕانی حەلەبە و سەرپەرەوەری کارباری مەلیکی سالحە، سەلاحەدین بڕیاری دا ناوی سالح لە خوتبەدا نەهێنێ و لەسەر دراو بیسڕێتەوە هەروەها بڕیاری دا جارێکی تر گەمارۆی حەلەب بداتەوە. ئەمجارە بەهێزێکی گەورەوە هێرشێکی توند و بەتاوی ڕێک خست و لە هەمان کاتدا دیلە حەلەبییەکانی بەرەڵا کرد ئەوانەی لە شەڕەیلی پێشوودا گیرابوون، تا ڕەفتار چاکیی خۆی بە خەڵکی حەلەب پیشان بدات، ئەوانیش گەڕانەوە شاری خۆیان و زمانیان هەر لە سوپاسبژێریی (سەرکردە)دا دەگەڕا.

لە کاتی گەمارۆکەدا مەلیکی سالح، خاتوونی خوشکی، کە کچێکی بچووک بوو، نارده لای سەلاحەدین، ئەویش بە ڕێز و بەجوانی بەخێری هێنا و بۆ باوکی گریا و گەلێ دیاری و گەوهەر و شتی نایابی خەڵات کرد و لێی پرسی کەسوکاری چییان

١٠٥. العماد، سنا البرق الشامی، بەرگی ١، ل٢١٠-٢١١.

دەوێ؟ گـوتی: عـەزازیان دەوێ. ئەویش پێی دا و زۆر جـوان بەڕێی کـرد و خـۆی گەڕاندییەوە بەر دەرگەی شار[١٠٦]. بەڵام گەمارۆی لەسەر حەلەب هەڵنەگرت، کاتێک مەلیکی ساڵح زانیی شەڕەکە بەڕاستییە و لەوانەیە شاریش لە بەرگریکردندا خۆی نەگرێت و لە دواییدا ئەو پەنایەشی لەدەست بچێت، بەتایبەتی وا سەلاحەدین چی دی خۆی سەر بەو نازانێت و ناوی ئەوی لەسەر دراو و لە خوتبەدا نەهێشتووە، چەند کەسێکی ناردە لای بۆ وتووێژ و بەستنی پەیمانی ئاشتی لە نێویاندا، کەوا ئەو ناوچەیلەی سەلاحەدین گرتوویانی بۆ سەلاحەدین بن، ئەوانیش چییان بەدەستەوە ماوە لە وڵاتی شام بۆ خۆیان بێت. بەم جۆرە سەلاحەدین بوو بە سەرورەری دیمەشق و حیمس و حەما و بەعەلبەک و وردە شارەکانی تریش کە گرتبوونی. لەسەر ئەوەش رێک کەوتن کە هەموویان (حەلەب و موسڵ و سەلاحەدین) لە دژی خاچپەرستانی داگیرکەر یەک دەست بن و نابێ هیچ لایەکیان پەیمان بشکێنێت.

سەلاحەدین گەڕایەوە دیمەشق و لە مانگی شەوالی ئەو ساڵەدا (ئایاری ١١٧٥ز) لە ناو ئاهەنگ و شادیی خەڵکیدا گەیشتەوە شار. دوای ئەوەی خەلیفەی عەباسی (المستضيء بالله) پشتگیریی لە باری تازەی شام کرد و خەڵاتی بۆ نارد. سەلاحەدین پلەی چەسپاوتر بوو، بە سەروەری میسر و شام ناسرا و لە مزگەوتەکاندا خوتبە بەناوی ئەو دەخوێندرایەوە و بەناوی ئەو دراو لێ درا کە لەسەر دراوەکە نووسرا: "الملك الناصر يوسف بن أيوب علا جاهه".

لەو دەمەی لە دیمەشق بوو بێوەژنی نوورەدین مەحموودی لەخۆی مارەکرد کە عیسمەتەدین خاتوونی کچی معینەدین ئەنەری سەرورەری دیمەشق بوو پێش ئەوەی نوورەدین بیگرێت و مەلیکی ساڵحیش کوڕی نوورەدین لەو دایکە نییە، سەرچاوەکان باس دەکەن سەلاحەدین بۆ "پاراستنی رێز و ئابروو و رووسووریی[١٠٧]" ژنەکە هێنای و لەوانەشە لەم ژنهێنانەدا مەبەستی ئەوە بووبێ لە لایەکەوە وا نیشان بدات خۆی میراتگری نوورەدینی ئاغایەتی و لەلایەکی ترەوە پێوەندیی نێوان خۆی و ماڵی ئاغای پتەوتر بکات و بۆ بەدیهێنانی پڕۆژەکانی

---

١٠٦. النوادر السلطانيه، ل٥٢. الروضتين، ٢٦١/١١.

١٠٧. الروضتين، ١/٢٦٣-٢٦٤.

دوارۆژی پارمـەتیی لێ وەربگرێت. بێگومـان سـەلاحـەدین داهێنەری ئەم جـۆرە ژنهێنانە سیاسییە نییە[١٠٨].

پاشان بیری بۆ ئەوە چوو تۆڵە لە ئیسماعیلییـەل بکاتەوە کە دوو جار ویستیان بیکوژن و هـێرشـێکی بردە سـەریان لە (جبل السـاق)دا و چەند گـوندێکی لێیـان سـووتانـد و کـاول کـرد و زۆری لێیـان کـوشـت و زۆری بە دیل گـرت، پاشـان قـەڵای مسیافـی (نێزیک تەرابلۆس)ی گەمارۆ دا کە سینان ڕاشیدەدینی سـەرۆکیانی لێ دادەنیشت. ئەمیش هانای بۆ سـەروەری حەمـا شـەهابەدین مـەحموود ئەلحارمیی خـاڵی سـەلاحـەدین برد، بەو پێـیـە کـە هاوسـێی یەکن و داوای لێ کـرد لای خـوارزاکـەی تکاکـاری بێت[١٠٩]. خـاڵیـشی داوای لـێ کـرد لێی ببـوورێ ئـەویش بەقسەی کرد.

لەم ماوەیەشـدا ڕێککەوتننامەیەکی دەستدرێژنەکردنی لەگەڵ خاچپەرستان مۆر کرد. بۆ ئەوەی خۆی بۆ کایەیەکی تر ئامـادە بکات، تاکو سوپایەکی پڕچەک و تفاق و بەژمـارە زۆرتر و چاکتـر ڕێک دەخات، ئەم ڕێککەوتننامەیەش نیوە ئاگربەستێک بوو لەنێوان هـەردوو لا. لەم وەختـەدا، شەمسول دەولە توران شـای برای، هاتە لای و پیـرۆزبایی سـەرکـەوتنی لێ کـرد بۆ گـرتـنی شـارەیلی شـام و کۆکـردنەوەیان و نەهێشـتنی پەرتەوازەییـان و پاراسـتنیـان لە کـەوتنە ژێر چەپۆکی خـاچپـەرسـتی دوژمنی چاوبرسی. کاتێک سـەلاحەدین زانیی کە پێویستی بە کەسـێکی بەهێزە بۆ بەڕێوەبردنی کاریاری شام، کە ببێتە جێگری خـۆی، لە تۆرانشـای برای باشـتری نەدۆزییەوە[١١٠]. پاش دڵنیابوون لە چاکیی ڕێکخستنی باری شام لـەڕووی پێوەندی بە دوژمنـەوە و، بە تایەفـەی ئیـسـمـاعـیلی و لەگـەڵ مـەلیکی سـاڵح لە حـەلەب و ئامـۆزایەلی لە مـوسڵ، سـەلاحـەدین بڕیـاری دا بگەڕێتـەوە مـیـسـر تا کـاریاری دەوڵەتەکەی بەسـەر بکاتەوە و کەسوکار و منداڵەکانی خۆی ببینێ. ئەوە یەکەمین جاریش بوو بەو ناونیشانە، سـەروەری شام و میسر، بگەڕێتـەوە و لە جاران زیاتر شـایانی ناسناوی (ئـەلمەلیک ئـەلناصـر) بـوو کـە خـەلیـفـەی فـاتیـمی پێی دابوو، سیفەتی سوڵتان و سـەروەری میسر و شـام و یەمەنیشی خرایە سەر.

١٠٨. د. سعيد عبدالفتاح عاشور، الحركة الصليبية، ٢/٧٥.

١٠٩. سنا البرق الشامي، ١/٢١٨-٢١٩. مفرج الكروب، ٢/٤٨.

١١٠. الروضتين، ١/٢٦٠.

## سەلاحەدین دەگەڕێتەوە میسر

لە ١٦ی ڕەبیعول ئەوەلی ٥٧٢ک/ کۆتای تشرینی دووەمی ١١٧٦ز، سەلاحەدین گەیشتەوە قاهیرە. پاش ئەوەی دوو ساڵ بوو بەجێی هێشتبوو، سەرکەوتووانە و دڵنیا لە سەرکەوتن بۆی گەڕایەوە. مەلیکی عادل، سەیفەدین ئەبوبەکری برای و جێگری لە میسر بۆ پێشوازیکردنی سەلاحەدین لە زەریای سوور پەڕییەوە ئەوبەری سینا. کاتێک کە هاتەوە، بیری هەر لای گەڕانەوە بوو بۆ شام تا ئەو هەنگاوانەی تەواو بکات لەوێ نابوویانی.

## سەڵاحەدین شارەیلی هەرێمی جزیرە دەگرێت

پاش ئەوەی سەڵاحەدین لە سەلامەتی و قایمکاریی قاهیرە دڵنیا بوو، بڕیاری دا میسر بەجێ بهێڵێ و بچێتە شام بۆ دیاریکردنی هەڵوێستی شیاو، دوای بیستنی هەواڵی مردنی مەلیکی سالح، ئیسماعیلی کوڕی نوورەدین مەحموود لە ٥٧٧ک/١١٨١ز و جێگرتنەوەی لەلایەن عیزەدین مەسعوودی ئامۆزای و سەروەری موسڵ لە بەڕێوەبردنی کاروباری حەلەب. عیزەدین مەسعوود بۆ چەسپاندنی پێی خۆی لە خوکمی شاردا دایکی مەلیکی سالحی لەخۆی مارە کرد و هەرچی گەنجینەی شار هەبوو هەمووی برد و بیری لە پەلاماردانی دیمەشق کردەوە، بەتایبەتی کە سەڵاحەدینی لێ دوور بوو. بەڵام لە ورووژاندنی سەڵاحەدین دەترسا، لەلایەکی تریشەوە پەلهاویشتنی لەوانە بوو ببێتە هۆی پەلهاویشتنی عیمادەدین زەنگیی دووەمی برای کە سەروەری سنجارە و خەڵکی حەلەب ڕێزیان دەگرت و وەختی خۆی داوایان لە مەلیکی سالح کرد بیکاتە جێگری خۆی، تەنانەت هەندێ میر لە میرانی حەلەب بە نهێنی نامەیان بۆ نارد کە خێرا بێت کاروباری حەلەب وەربگرێت[111].

عیزەدین مەسعوود دوای ئەوەی لە دۆخی حەلەب دڵنیابوو، بەرەو موسڵ کەوتە ڕێ و کە گەیشتە (الرقه) لەسەر فورات، قاسیدی عیمادەدینی برای هات بۆ ئەوەی داوای لێ بکا حەلەب بدا بەو، ئەویش لە جیاتی حەلەب سنجاری بداتێ، واتا شارەکان بگۆڕنەوە. عیزەدین مەسعوود قایل نەبوو بەڵام لەوەش دەترسا ئەگەر داخوازییەکە ڕەت بکاتەوە لەوانەیە عیمادەدین دەست لەگەڵ سەڵاحەدین تێکەڵ بکات، بۆیە وازی لە حەلەب هێنا و سنجاری وەرگرت و گەڕایەوە موسڵ.

سەڵاحەدین لەو ماوەیەدا ڕووداوەکانی شام و جزیرەی بەرچاو خستبوو و هەستی کرد ڕووداوەیل پڕ مەترسین، بۆیە بڕیاری دا بگەڕێتەوە شام، پاشان لە

---

١١١. ابن العديم، زبدة الحلب، ٣/٤٥.

شـامـەوە بەرەو حـەلەب چوو و سێ ڕۆژ گـەمـارۆی دا، بەڵام کە زانیـی بەزەحـمـەت دەگـیـرێت وازی هێنا. لـە حـەلەبەوە بـەرەو شـارەیلی تری هـەرێمـەکـە کـەوتە ڕێ، حوکمڕانەیلی حەلەبیش کە زانییان سـەلاحـەدین تەماح لە سەر و سامانیان ناکات و ئەگەر نیازیان پاک بێت، بەسـەر شـارەکەیانەوە دمیانهێڵێتـەوە، سـازیی خـۆیان دەربڕی بۆ بەشـداریکردن لـە ڕزگـارکـردنـی خـاک لە چەپۆکی داگـیـرکـەری خاچپەرست.

ئەوەبوو حوکمڕانـی ماردین هاتە لای و حـوکـمڕانی (حسن کیف)یش نوێنەری ناردە لای و لایەنگریی خۆیان ڕاگەیاند.

عیزەدین مەسعوودیش، بە خـۆی و هێزەکەیەوە بۆ پاراستنی حـەلەب کەوتە ڕێ، بەڵام لەناکـاو تووشی سـەلاحـەدین هـات کـە بە سـوپاوە لە فـورات پـەڕییـەوە و بۆ بەرەنگاریی هات. عیزەدین جڵەوی بادایەوە و گەڕایەوە موسڵ. سـەلاحەدین ئەمەی بە هەل زانـی و ڕووی کـردە شـارەیلی جـزیرە، ڕەهـا و حـەران و ڕەقـە و سـروج و نوسـەیبین و چەند شـارێکی تری گـرت[١١٢]. پاشـان بـەراوێژی هـەندێک لـە سەرکردەیلی خـۆی ڕووی کردە موسڵ و گەمارۆی دا، بەڵام لەبەر قایمیی شوورەیل و بەربەرەکانەی توندی سەربازەیلی، نەیتوانێ بیگرێت[١١٣].

سـەروەری مـوسـڵ هـیـچی بۆ نـەمـایـەوە ئەوە نەبێ کـە هـانـا بۆ هـەندێ مـیـری دراوسـێ، وەکـو قـزل ئـەرسـەلانی سـەروەری ئازەربێـجـان و شـاه ئـەرمـەن ناسـرەدین سـەگـمـان کوڕی ئیبراهیم میری خەلات ببا. کاتێک ناسر دینەلای عەباسی هەستی بە مەترسیی دۆخەکە کرد ویستی کارێک بکات لایەنەیل پێک بێنێت، بۆ ئەم کارەش (شـەیخـول شـیـوخ سـەدرەدین عـەبدوڕەحیم)ی ڕاسـپارد ناوبژی بکات، بەڵام ڕێک نەکەوتن[١١٤].

پاشـان سـەلاحـەدین زانیی چاری نییە و دەبێ واز لـە موسڵ بێنێت، پاش ناوبژیی خەلیفـە و پاش ئەوەی موسڵ پەیمانێکی لەگەڵ خـاچپەرستان مۆر کرد و سـەروەری

---

١١٢. ابن شداد، النوادر، ل٥٧. ابن العديم، زبدة الحلب، ٣/٥٨.

١١٣. الكامل، ١١/٤٨٤-٤٨٥. الروضتين، ٢/٣٣.

١١٤. ابن شـاهنشـاه، مضـمـار الحـقائق وسـر الخـلائق، خـانەی الهنا، چاپی عـالم الكتب، قاهيرە ١٩٦٨، ل١٠٧-١٠٨.

موسڵ بەڵێنی دا ساڵانە ١٠٠٠٠ دینار بە خاچپەرستان بدا، لەگەڵ هەندێ شاری سەرسنووری موسڵمانان، هەروەها دیلەکانیشیان ئازاد بکات. ئەوانیش دژی سەلاحەدین یارمەتیی بدەن. سەلاحەدین لە سەرەتای ساڵی ٥٧٩ک/ حوزەیرانی ١١٨٣ز ڕووی کردە حەلەب و گەمارۆی دا و شار خۆی بەدەستەوە نەدا. بەڵام عیمادەدین زەنگیی دووەم زانیی ناتوانێ تا سەر بەربەرەکانەی گەمارۆکە بکات، چونکە دەرهەقەتی ئەو خەرجییە زۆرە نەدەهات، بەتایبەتی کە عیزەدین مەسعوودی برای پارەیەکی زۆر کەمی لە خەزینەدا بەجێ هێشتبوو و دەستی یارمەتیی بۆ برای خۆی درێژ نەکرد. سەرباری ئەوەش سەلاحەدین بۆ کارکردنە سەر وورەی شەڕوانەیلی ناو شار بڵاوی کردەوە کە چەند خانوویێک لەسەر چیای دۆشەنێ نێزیک حەلەب دروست دەکات و بەمە ترسی خستە دڵی حەلەبییەکانەوە[115].

ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی عیمادەدین زەنگی داوای وتووێژ لە سەلاحەدین بکات و گوتی ئەگەر ئەو سنجاری بداتێ حەلەبی تەسلیم دەکات. سەلاحەدین بەمە ڕازی بوو، سەرباری سنجاریش، خابوور و ڕەقە و نوسەیبینشی دایە. بەم جۆرە لە مانگی سەفەری ٥٧٩ک/ ١١٨٣ز حەلەب چووە خانەی هەوڵی سەلاحەدین بۆ یەککگرتن دژی داگیرکەرەیل. ئەم هەنگاوەش بۆ پرۆژەی غەزای دواڕۆژ زۆر گرینگ بوو و ئەنجامی باشی هەبوو، کە جڵەوی کارباری وڵاتی شام کەوتە دەست سەلاحەدین، دەوڵەتەکەی لە کەنارەکانی ئەفریقیای باکورەوە تا وڵاتی نیل و تا فوراتی گرتەوە، جگە لە یەمەن، جارێکی تریش کۆششی یەکێک لە بنەماڵەی زەنگیی ئەتابەگی چووە پاڵ کۆششی بنەماڵەی ئەیووبی. چونکە هەردوو لا لەسەر ئەوە ڕێک کەوتن کە ئەو ناوچانەی عیمادەدین زەنگیی دووەم وەریان دەگرێ لە کاتی پێویستدا دەبێ بخرێنە ژێر دەسەلاتی سەلاحەدین[116].

سەلاحەدین بەڵێنی ئەوەیشی لە عیمادەدین وەرگرت ئەگەر هات و هێرشی بردە سەر موسڵ نابێ یاریدەی عیزەدین مەسعوودی برای بدا. هەرچی هێزەیلی خاچپەرستیشە، دەستگرتنی سەلاحەدین بەسەر حەلەب و دەوروبەریدا بووە زەنگی وریاکردنەوەیان لەوەی ئەمە هێزێکی نوێی بە سەلاحەدین دا و پایەی

١١٥. الکامل، ١١/٤٩٦. مفرج الکروب، ١٤١. زبدە الحلب، ٣/٦٤.

١١٦. الروضتین، ٢/٤٣.

حـوكـمـڕانیی لە وڵاتدا زیاتر چەسـپـاند... وای لێ هات بنکە و پێگەکـانی خـاچپەرستان لە کەناراوی شامدا کەوتنە بەر دوو بەردی دەستاڕی یەک دەوڵەت، دەوڵەتی سـەلاحـەدین و لە هەمـوو ڕۆژێک زیاتر لەبەردەم مەترسـیدان. سـەلاحـەدین کـە بەرەی ناوەخـۆی پتـەو کـرد، لە بیـری نەچوو کـە یەکەتی ڕێگەی ڕزگارکـردنی خـاکـە لە داگیـرکـەرەیل و ئەمـەمـان لەو سیـاسـەتە بۆ دەرکـەوێ کە لەو مـاوەیەدا پەیڕەوی دەکـرد، کـە هـەڵی دەکوتـایە سـەر بنـکەیلی خـاچپـەرسـتـان، بەر لەوەی لە پاشـەڕۆژدا بەتەواوی خـۆی بۆ بەرەنگارییـان سـاز بکات، بەم جـۆرە هەوڵی دا پێش ئەوەی ڕوو بکاتە موسڵ، بیسان و کەڕک وەربگرێتەوە[117].

١١٧. ابن شداد، النوادر، ٦٦, الكامل، ١١/٤٧٩.

## موسڵ تێکەڵ بە تێکۆشینی ڕزگاری دەبێت

پاش ئەوەی سەلاحەدین دەستی بەسەر حەلەبدا گرت، عیزەدین مەسعوود هەستی کرد پێگەی وڵاتەکەی لەق بووە و توانای بەربەرەکانەی سەلاحەدینی نابێ، ئەگەر سوپای سەلاحەدین گەمارۆی موسڵ بدات، بۆیە بۆ خەلیفەی عەباسیی نووسی و تکای کرد قسەیەک لە نێوانیاندا بکات، ڕای گەیاند کە سازە گفتوگۆ لەگەڵ سەلاحەدین بکات. خەلیفەش دەستەیەکی نارد کە شەیخول شیوخ سەدرەدین سەرۆکی بوو و نوێنەرانی موسڵیش بە سەرۆکایەتیی محیدین محەمەد شەهرەزووری و قازیی مێژوونووس بەهادین ئیبن شەدادی موسڵی، تێکەڵی بوون. لە زستانی ٥٧٩ک/ ١١٨٣ز پێکەوە چوونە دیمەشق، بەڵام بێ ئەوەی هیچ بەدی بهێنن گەڕانەوە، بەتایبەتی کاتێک نوێنەرێلی موسڵ ڕایان گەیاند ئەگەر سەلاحەدین بە مەرجەیلی حوکمڕانی موسڵ پەیمانی ئاشتی نەبەستێت، عیزەدین مەسعود داوای یارمەتی لە سوڵتانی عەجەم و هی تر دەکات، سەردەستەی ئەو مەرجانەش مانەوەی هەولێر و جزیرەی ئیبن عومەر بوو لەژێر دەسەڵاتی موسڵدا، بەڵام سەلاحەدین دەیگوت پێویستە حوکمڕانیی ئەم دوو شارە بدرێتە ئەو لایەنەی خۆیان دەیانەوێ سەر بە ئەو بن[118].

لە سەرەتای ساڵی ٥٨٠ک/ بەهاری ١١٨٤ز سەربازەیلی حوکمڕانی (حسن کیف) و (دارا) کەوتنە دوای سەلاحەدین، پاشان (موعیزەدین سنجەرشا)ی برازای عیزەدین مەسعوودیش لای مامی بەر دا و هاتە لای سەلاحەدین، دوای ئەمە لە ڕەبیعول ئەوەلی ئەو ساڵە (هاوینی ١١٨٥ز) سەلاحەدین بەرەو موسڵ چوو و داوای لە خەلیفە کرد دەستووری بداتێ موسڵ بگرێ، دەستەیەکیشی ناردە بەغدا و هۆی شەڕی لەگەڵ موسڵ ڕوون کردەوە، کەوا کاربەدەستانی موسڵ

١١٨. الایوبی، مضمار الحقائق، ل١٦٢-١٦٣. ابن شداد، النوادر، ل,٦ بۆ زانینی درێژەی وتووێژەکە، بڕوانە: ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/١٥٦.

ئاشنایەتیی سوڵتانی عەجەم دەکەن و ناوی لەسەر دراو دادەنێن، هەروەها نامە و نامەبەریان لەگەڵ خاچپەرستەکان بەردەوامە و هانیان دەدەن پەلاماری وڵاتی موسڵمانەیل بدەن، ئەویش -واتە سەلاحەدین- چاوی چنۆکی نەبڕیوەتە موسڵ و نایەوێ بنەماڵەی ئەتابەگی زەنگی لەناو ببات، بگرە دەیەوێ ڕێی ڕاستیان پێشان بدات و بیانگێڕێتەوە سەر ڕێی گوێڕایەڵیی خەلیفە و پشتگیریی ئیسلام و لە دۆستایەتی دوژمنان دایانبڕێت[119].

کاتێ کە عیزەدین مەسعوود دیتی سەلاحەدین لە موسڵ نێزیک بووەتەوە، زانیی کە دەبێ بەتەنیا بەرەنگاریی بکات، بۆیە دەستەیەک لە ژنانی کۆشکی شاهانەی زەنگیی ڕێک خست، کە کچی نوورەدین زەنگی یەکێک بوو لەوان تا داوای ئاشتی و خوێن نەڕژانی لێ بکەن. بەڵام هەندێ سەرکردەی سوپای سەلاحەدین بڕیاریان دا لە گەمارۆدانی موسڵ بەردەوام بن، ئەگەرچی موسڵیش ڕێککەوتننامەی لەگەڵ مەلیکەکانی ڕۆژهەڵات (ئازەربایجان و هەمەدان) هەبوو ئەگەر سەلاحەدین پەلاماری موسڵ و ماردین بدات شەڕی لەگەڵدا بکەن. گەمارۆدانەکە نێزیکەی مانگێکی برد، بەڵام سەلاحەدین جارێکی تر موسڵی بەجێ هێشت، چونکە هەواڵی پێ گەیشت کە شاه ئەرمەنی حوکمڕانی خەلات (شاری ئەرمینیای ناوەڕاست) مردووە و کوڕی نییە لە جێی دابنیشێ، سەلاحەدین پرس و ڕاوێژی بە هەڤاڵەیلی کرد چی بکات باشە؟ هەر لەو کاتەدا گەورە پیاوەیلی خەلات هاتنە لای و داوایان لێ کرد کە بێت خەلاتی بدەنێ ئەویش لە ترسی پەهلەوانی کوری ئیلدکزی حوکمڕانی ئازەربایجان و هەمەدان، کە نیازی داگیرکردنی ئەرمینیای هەبوو[120].

سەلاحەدین بە خۆ و سوپاوە موسڵی بەجێ هێشت و بەرەو خەلات چوو، لە میافارقین دابەزی و گرتی. ئەم کردەوە سوپاییە بە ڕووداوێکی گرینگ دێتە ژمار لە کێشەی سەلاحەدین لەگەڵ بنەماڵەی زەنگیدا، چونکە لە ئەنجامدا بوو بە سەروەری بێهاوتای هەموو ناوچەکە، بەتایبەتی کە خەلیفەش پیرۆزبایی لێ کرد و مافی تەماشاکردنی کارباری ئەو ناوچانەی پێ دا. بەم کارە پایەی پتەوتر بوو و هەر بزووتنەوەیەکی سوپایی ئەو بە ڕەنگێکی شەرعی ڕەنگ دەکرا.

---

١١٩. الروضتین، ٢/٦٢.

١٢٠. مفرج الکروب، ٢/١٦٦.

پاش ئەوەی سەلاحەدین کاروباری میافارقینی ڕێک خست، گەڕایەوە سەر گەمارۆدانی موسڵ و لە شەعبانی ٥٨١ک/ ١١٨٥ز لە نێزیک موسڵ دای کوتا. ئەوسا عیزەدین مەسعوود دڵنیا بوو کە دەرەقەتی هێزەیلی ئەم سەرکردەیە نایەت و هیوای بە پاراستنی موسڵ نەما، بەتایبەتی کە لە هیمدادی مەلیکی عەجەم و یارمەتیی خەلیفەی بەغدا بێ هیوا بوو، سەرباری ئەوەش کە سەلاحەدین بڕیاری دا بەرامبەر بە موسڵ زۆر بمێنێتەوە، هەتا زەوی و زارەیلی ئەوێ بەسەر سەرکردەیلی سوپاکەیدا دابەش کرد و دەغل و دان و بەروبوومەکەشی کۆ کردەوە، تاکو بەرگریی موسڵی پێ بێ هێز بکات. بەم جۆرە مانگی شەعبان و ڕەمەزانی لەوێ بەسەر برد[١٢١].

پێ دەچێ سەلاحەدین لە درێژەکێشانی گەمارۆکە بێزار بووبێت و وای بە بەرژەوەندی زانی بێت کە هەڵوێستەکە ئاشتییانە چارەسەر بکات بۆ ئەوەی دووبەرەکی نەمێنێ و خوێنی موسڵمانەیل نەڕژێت و ئەو خوێنە بۆ غەزای دوارۆژ هەڵبگیرێ.

لەوانەشە لەوە ترسابێت دوژمن دوورکەوتنەوەی ئەو لە شام بەهەل بزانێت و هێرشێکی لەناکاو بباتە سەر وڵات.

ئەوەی ئەم ڕایانە دەسەلمێنێ ئەوەیە کە لەدوای عیمادەدین زەنگیی دووەمی حوکمڕانی سنجاری ناردبێت، بۆ ئەوەی ناوبژی بکات لە نێوان هەردوو لادا. پاش ئەوەی قاسید لە هەردوو لاوە هاتن و چوون، لەسەر ئەوە ڕێک کەوتن کە وڵاتی شارەزوور و خەلات و ئاواییەلی ئەوێ، لەگەڵ ناوچەی نێوان دوو زێ بدرێتە سەلاحەدین[١٢٢] و دراو و خوتبە بەناوی ئەو بێت.

سەلاحەدینی سەرکردە نەخۆش کەوت و موسڵی بەجێ هێشت و چووە حەڕان، لەوێدا مەلیکی عادل، ئەبوبەکری برای، لە حەلەبەوە هات و پزیشکانی ئەوێشی لەگەڵدا بوو[١٢٣] هەروەها بە سەرۆکایەتیی قازیی مێژوونووس بەهائەدین ئیبن شەدادی موسڵی، نوێنەرانی عیزەدین مەسعوود گەیشتنە لای و ئاشتی لە نێوان

---

١٢١. الكامل، ١١/٥١٧.

١٢٢. الروضتين، ٢/ ٦٤، مفرج الكروب، ٢/ ١٧١.

١٢٣. النوادر، ل. ٧٠

هەردوو لایاندا سەری گرت، هەردوو لا سوێندیان بۆ یەکتر خوارد و لە ئەنجامی ئەمــە لە زیل حــیــجــەی ٥٨١ك/ ئاداری ١١٨٦ز بەولاوە لە دیاربەکــر و ولاتی ئەرتەقیدا خوتبە بەناوی ئەو خوێندرایەوە[١٢٤].

ئەم ئاشتینامەیە دەستکەوتێکی باش و سەرکەوتنی سیاسەتی سەلاحەدین بوو، کە بەهۆیەوە توانیی پایەی خۆی بچەسپێنێ و بۆ بەرەنگاریی داگیرکەران خۆی ساز بدات. ئەمەش لەم نامەیەدا دیارە کە عیمادی کاتبی ئەسفەهانی بە پێنووسی ڕەنگینی خۆی، لە زمانی سەلاحەدینەوە، بۆ سەیفول ئیسلام نوغتەکینی برا و نوێنەری لە ولاتی یەمەندا، ناردوویەتی کە پێی ڕاگەیاندووە:

"لە مەرجەیلی ئاشتینامەکە لەگەڵ ئەتابەگی موسڵ ئەوەیە کە دەبێ لەژێر فەرمانماندا بێت و سەربازمان بۆ بنێرێت و دراو و خوتبە بەناوی ئێمە بێت. ئیدی سام و شکۆ و هیمەت بۆ غەزا لە پێناوی خوا پەرەی سەند"[١٢٥].

بە مۆرکردنی ئەم بەیاننامەیە سەرکردەی یەکەتیی میسر و شام و یەمەن و ولاتی جزیرەی تەواو کرد و گرینگترین شارەیلی، وەکو حەلەب و میافارقین و ئامێدی و موسڵ هاتنە ژێر ئالای سەرکردایەتیی ئەو، کە بە گرتنی حەلەب هەموو ولاتی شام (جگە لە لێواری دەریا و قودس) تێکەڵ بە میسر بوون، بە گرتنی میافارقینیش هەرێمی دیاربەکر کەوتە دەستی و بەرێککەوتن لەگەڵ موسڵیش ناوچەی جزیرە تێکەڵ بە تێکۆشینی یەکگرتنەوەی بوو. ئەو دەمە وەکو سەرکردەیەکی ئیسلامیی غەزاکەر، پێی خۆی لە مەیدان چەقاند و"بەڕاستی بوو بە سەلاحی دین و دنیا... کۆڵەکەی دەوڵەت و دینی چەسپاند". هەر وەک هاوسەردەمێکی[١٢٦] دەڵێ: بە لەخۆبوردەیی و ئازایەتی و ڕەوشتی بەرزی ئیسلامەتی توانیی بەسەر میرە موسڵمانە بەرهەڵستەکانیدا زاڵ بێت، ئەمەش بە لێکدانەوە و نەخشەی سیاسی و سوپایی و کەڵک وەرگرتن لەو بارودۆخەی کە کۆمەڵگەی ئیسلامیی ئەو ڕۆژەی تێدا دەژیا و داواکردنی ئەو داخوازییانەی گەلی

---

١٢٤. الروضتین، ٢/٦٤. مفرج الکروب، ٢/١٧١-١٧٢. ابن خلکان، وفیات الاعیان، ٥/ ٢٠٧.

١٢٥. الروضتین، ٢/٦٤.

١٢٦. اسامە بن منقذ، الاعتبار، چاپخانەی زانکۆی برنستن، ئەمەریکا ١٩١٣. ل١٦٥.

موسڵمانەیل ئاواتیان بوو، وەکو یەکگرتنی تێکۆشینی هەموو لایەک و پتەوکردنی ڕیز بۆ ڕزگارکردنی قودس و بەشەیلی تری وڵات. بەم شێوەیە دوای ئەوەی باوەڕ و دڵی خەڵکی بۆ لای خۆی بەکێش کرد، هەموو لە ژێر ئاڵایدا کۆبوونەوە[١٢٧].

١٢٧. د. درید عبدالقادر نوری، سیاسە صلاح الدین فی بلاد مصر والشام والجزیرە، چاپخانەی الارشاد، بەغدا ١٩٧٦، ل.٢٥٧

## شەڕەیلی سەلاحەدین دژی خاچپەرستەیل، پێش حەتین

پێویست بوو سەلاحەدین رێی نێوان دوو بنکەی دەوڵەتەکەی لە میسر و شام، پاک بکاتەوە. بۆیە پاش دامەزراویی دەوڵەت، زوو شەڕی بەو بنکە خاچپەرستانە فرۆشت کە لە ناوچەی سەر رێی میسر و شام بوون، بۆ ئەوەی تەناهی بۆ رێی کاروان و هیمدادی سوپایی و کاروانی حاجییەل دابین بکات. هێزی خاچپەرستانی شام و ئەورووپاش هەستیان بە مەترسیی دامەزراندنی دەوڵەتێکی بەهێزی وا کرد، کە لە سەرەتاوە بۆ دامەزراندنی سوپایەکی تازەی بەهێز کار دەکات و بێ حسێب پارە بۆ رێکخستن و سازدان و چەک و تفاق خەرج دەکات[١٢٨].

ئەمەش مانای وایە میسر لەو خەوە ڕادەپەڕێ کە بەهۆی بێ دەسەلاتیی کارگێڕانیەوە، لە دوادوای تەمەنی دەوڵەتی فاتیمیدا سستی کردبوو. لەو رۆژەوە کە سەلاحەدین وەزارەتی میسری گرتە دەست، بڕیاری دا بەپشتبەستن بە توانی گەورەی داراییی میسر سوپایەکی بەهێز دابمەزرێنێ و چەک و تفاقی بۆ ساز بکات. هێزەیلی خاچپەرستیش دەبوو لێی بەئاگا و وریا بن نەوەکو میسر ببێتە بنکەی رووبەڕووبوونەوەی سەبازیی ئەو خاچپەرستانەی دەیان ساڵە لە کەناراوی شام و بەیتول مەقدیسدا پاڵیان لێ داوەتەوە، چونکە پێشووتر هێزێکی ئیسلامیی بەکاری وا نەبوو بتوانێ وەلامیان بداتەوە. بۆیە هەر لەسەر پیلانی داگیرکردنی میسر بەردەوام بوون، بەتایبەتی لەو دەمەی کە ئەموری هاتە سەر عەرشی مەملەکەتی قودس. هەروەکو لە لاپەڕەیل پێشوودا باسمان کرد.

بەلام هەر هەوڵێک لە هەوڵەیلی خاچپەرستەیل بۆ داگیرکردنی میسر گوڕ و تاوێکی تازەی بە سەلاحەدین دەدا، کەوا چەند جار سەرکەوتنی بەدەست هێنا و نەیهێشت ولات بکەوێتە ژێر چەپۆکی دوژمنەوە. هەروەکو باسی ئەو هەوڵە ئەنجام

---

١٢٨. محسن محمد حسین، الجیش الایوبی فی عهد صلاح الدین، چاپخانەی دەزگەی الرسالة، بەیرووت ١٩٨٦.

تاڵەی کەشتیگەلی سەقلیەمان کرد کە بە هاوکاریی دەستە و تاقمە پیلانگێرە دوژمنەکانی حوکمڕانیی ساوای لە ساڵی ٥٦٩ک/ ١١٧٤ز ڕووی دا، کاتێ سەلاحەدین توانیی پیلانەکە لە گۆڕ بنێت و نەهێڵێت سەقلییەکانی هاوپەیمانیان لە دەرەوە پێی بزانن. ئەوەبوو کەشتیگەلەکەیان گەیشتە ئیسکەندەرییە و توانیی بار و بارخانەی لە ئیسکەندەرییە دابگرێت و هەڕەشەیەکی پڕ مەترسی لە حوکمڕانیی سەلاحەدین بکات، بەتایبەتی کاتێ بازرگانە ئیتاڵییەکان دەستی یارمەتییان بۆ داگیرکەرەیل درێژ کرد، بەو هیوایەی بەهۆی ئەوانەوە دەست بەسەر شاردا بگرن، بەلام بەرەبەرەکانەی هێزەیلی سەلاحەدین نەخشەی شالاوهێنەرەیل و بازرگانە ئیتاڵییەکانی پووچ دەرهێنا، سەیر لەوەدایە بازرگانەکان هەستیان بە هەڵە و هەڵەشەییی خۆیان کرد و لەوە ترسان سەلاحەدین دەریان بکات و بەرژەوەندی و سامانیان نەهێڵێت، بۆیە سەرۆکەکانیان تکایان لە سەروەری میسر کرد ئەم جارە لێیان ببوورێت و زیان بە بەرژەوەندەکانیان لە شار نەگەیەنێ[129].

بەم جۆرە شالاوەکەی خاچپەرستان سەر نەکەوت، لە هەمان کاتیشدا سەلاحەدینی لەوە ئاگەدار کردەوە کە دەبێ کەناراوەکانی میسر قایم بکات، نەوەکو جارێکی تر هەڵمەت ڕێک بخەن و پەلاماری موسڵمانەیل بدەن. بەلام خاچپەرستەیلی شام هێرشیان بردە سەر حارم[130]. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی سەلاحەدین پەلاماری بنکەیلی خاچپەرستان لە نێزیک میسر بدات و بۆ ئەمەش ڕەملەی هەڵبژارد.

129. Grousset, Histoire de Crosades, paris 1935, Tomp.619.

١٣٠. حارم قەلایەکی قایم و شارێکی گەورەی ڕوو لە ئەنتاکیەیە، سەر بە حەلەبە. معجم البلدان، بەرگی ٢، ل٢٥٢.

## شەڕی ڕەملە

ڕەملە، وەکو یاقووت باسی کردووە، ئەو وەختە لە گەورەترین شارەیلی فەلەستین و پێشتر پایتەختی بووە و ڕزگارکردنی ئەوێ ئاواتی سەلاحەدین بووە، دوای ئەوەی دۆخی میسر و شام و جزیرەی بۆ دامەزرا، بەرەو فەلەستین بزاوتی بە هێزەیلی کرد و، سەرەتا لە شاری بلبیس هەڵی دا و جارچی بەناو سەربازاندا جاڕی دا دەبێ هەر یەکێک خواردنی ١٠ ڕۆژی زیاد لەگەڵ خۆی هەڵبگرێت[١٣١].

هێزەیل لە جومادای ئولای ٥٧٣ک/ ١١٧٧ز بەڕێ کەوتن و گەیشتنە عەسقەلان. سەربازەیل هەرچییان لەوێ دەست کەوت بردیان و ژمارەیەک خاچپەرستیشیان کوشت، کاتێ زانییان سەربازانی دوژمن بەچاکی بەربەرەکانێیان ناکەن، زیاتر لە بنکەکانیان چوونە پێشێ بۆئەوەی دەستکەوتی زۆرتر پەیدا بکەن. سەلاحەدین لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لە سەربازانی لە کن ڕەملە، نێزیک (تل الصابیه)[١٣٢] مایەوە و خۆی و هێزەکەی ساز دەکرد بۆ هێرشی چاوەڕوانکراو و بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ دوژمندا. بەڵام ئەنجام بەو شێوەیە دەرنەچوو کە سەلاحەدین دەیویست و بەشی بووە کۆستێکی سوپایی چاوەڕوان نەکراو.

سەلاحەدین ئەم شکانەی بۆ ئیبن شەدادی مێژوونووس بەوە لێک داوەتەوە کە خەتاکە لەوەدا بوو سەربازەیل شڵەژان کاتێک کۆمەڵێک لە لای باڵی ڕاستەوە (المیمنة) پەڕینەوە باڵی چەپ (المیسرة) و کۆمەڵێ لە باڵی چەپ چوونە لای ناوەند (القلب). کاتێ کە ئەوان خەریکی ئەو ئاڵوگۆڕە بوون فەڕەنگەکان پەلاماریان دان و زیانێکی گەورەی لێیان دا، لەبەرئەوەیش کە لەو نێزیکانەدا قەڵایکی وای لێ نەبوو سەربازەیل پەنای بۆ ببەن، بەرەو میسر ڕایان کرد و لە بیاباندا ڕێیان بزر کرد و پەرت و بڵاو بوون[١٣٣] هەندێکیشیان لێ بە دیل گیرا، یەکێک لەو دیلانە عیسای

١٣١. العماد الکاتب، سنا البرق الشامی، ١/٢٥٣.

١٣٢. قەڵایەکە لە نێزیک (بیت جبرین) سەر بەناوچەی ڕەملەیە، معجم البلدان، ١/١٦٧.

١٣٣. ابن شداد، النوادر، ل٥٣.

هەکاریی مەلا و شەرعزان بوو.

شکانەکە سووک نەبوو، کارێکی گەورەی لە دەروونی موسڵمانەیل کرد، تەنانەت ئیبن شەدادی مێژوونووس دەڵێ: شکانێکی گەورە بوو، سوپاس بۆ خوا، خوا بە شەڕی بەناوبانگی "حەتین" تۆڵەی کردەوە[١٣٤].

بەڕاستی ئەنجام و کاریگەریی ئەو شەڕە لەسەر دەروونی سەلاحەدین تاڵ بوو و لەمەوە تێ گەیشت کە سەرکەوتن بەسەر دوژمنی داگیرکەردا کارێکی سووک و ئاسان نییە، دەبێ کارباری خۆی زۆر باش ڕێک بخات پێش ئەوەی ڕووبەڕووی شەڕێکی تر بێتەوە. ئەگەر بمانەوێ هۆی ئەم شکانە بزانین وا چاکە لەم چەند خاڵەدا پوختەیەکی پیشان بدەین:

١- ونبوونی سەلاحەدین لەبەر چاوان، هەتا شەرکەرەیل وایان زانی کوژراوە، ئەمەش کاری لە دۆخی دەروونییان کرد.

٢- سەربازەیل پێش کاتی بەیەکدادان، بەشێوەیەکی چاک ریزەیلی خۆیان ڕێک نەخستبوو و باڵەیلی سوپایان ڕێک و پێک نەکردبوو.

٣- سوپای خاچپەرست چەند سەرکردەیەکی بەناوبانگی لەگەڵدا بوو، چ لە تیپی "ئەسپتاری" و چ لە تیپی "داوییە"[١٣٥].

٤- خاچپەرستەیل شێوازی ناکاوگیرییان (مباغتە) بەکار هێنا کە سەیریان کرد ریزی سوپای ئەیووبی شڵەژانی تێ کەوتووە، بەر لەوەی لێ بگەڕێن خۆی ڕێک بخاتەوە. لە ئەنجامی ئەمەدا سوپاکە تووشی ئاژاوە و لێک دابڕان و پەرت و بڵاوی بوو. هەتا سەرکردەیلی سوپا ناچار بوون ڕووبەڕوو شیربازی لەگەڵ سەرکردە و میر لەشکرەیل خاچپەرست بکەن.

---

١٣٤. هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە. ابن خلکان، بەیرووت، ٧/١٦٨.

١٣٥. ئەسپیتاری لە وشەی Hospitalـەوە هاتووە، واتە سوارەی نەخۆشخانە، داوییەش واتە سوارە هەژارەکانی مەسیح. ئەمانە دوو تیپ بوون لە فەلەستین پەیدا بوون و لە کەسانی ئاینپەروەر پێک هاتبوون. بەتایبەتی لە هەڵمەتی یەکەمی خاچپەرستانەدا. بەڵام دوایی بوونە دوو تیپی سەربازیی گرینگ و لە شەڕدا توانییان چەند قەلایەک لە خاکی داگیرکراو بگرن. بڕوانە محمد المطوي، الحروب الصليبية، چاپی ١٩٥٤، ل٧٠-٧١. فیلیپ حتی، العرب، ل٧٣٤.

٥- ئەوەی قوڕەکەی خەستتر کرد کورتهێنانی ئازووخە بوو لە سوپای ئەیووبی[١٣٦].

ئیتر هێزە سوپاییەکە بڕیاری دا بەرەو میسر بکشێتەوە و چاوەڕوانی ڕا و فەرمانی سەلاحەدینی نەکرد کە لەبەر چاو نەمابوو، بۆیە قازی فازڵی ڕاوێژکاری لەگەڵ هەندێ هەڤاڵانی لە ڕێی خۆیاندا بەرەو میسر بەدوایدا گەڕان، پاشان دۆزییانەوە و بەو خۆراکەی پێیان بوو فریای کەوتن، لە ناوەڕاستی جومادای ئاخیری ٥٧٣ک/ کانونی یەکەمی ١١٧٥ز گەڕانەوە قاهیرە[١٣٧]. بەڵام بەر لە گەڕانەوەی بەهۆی حوشترسواری خێراوە هەواڵی ساخ و سەلامەتیی بە میسر گەیشت، بۆ ئەوەی سنوورێک دابنێ بۆ ئەو بەند و باڵۆرانەی دەربارەی کوژرانی سەرکردە بڵاو بووبوونەوە، هەروەها سنوورێکیش بۆ هەر کەسێک دابنێ کە تەمای بێت لە حوکمڕانیی سەلاحەدین یاخی بێت، بەتایبەتی پاشماوەی لایەنگرەیلی حوکمی فاتیمی. جا کە گەیشتەوە قاهیرە بە پۆستەی ئاسمانی (کۆتری نامەبەر) کارتی مزگێنی و دڵنیایی بۆ هەموو لایەکی میسر هەڵگرت[١٣٨].

سەلاحەدین و یارمەتیدەرانی توانییان زوو لەو تەنگانەیە ڕزگاریان بێت و لە ماوەی دوو مانگ کەمتر هێزی سوپایان ڕێک خستەوە و سازی هەڵکوتانە سەر دوژمن بوون، دوژمنیش لەلای خۆیەوە دەستی کرد بە قایمکردنی سەنگەرەیلی، چونکە شەڕەکەی ڕەملە وریای ئەو پێویستییەی کردەوە.

ئەوەبوو پاش ئەم شەڕە خاچپەرستەیل قەڵایەکی پتەویان لە کن (مخاضة الاحزان)ی نێزیک دیمەشق دروست کرد، بەجۆرێ قایم بوو کە دیوارەکەی ١٠ گەز پان(!) و لە بەردی ڕەق و قسڵ دروست کرابوو، ئاسن کاری لێ نەدەکرد، هەرچەند سەلاحەدین دەیزانی ئەم قەڵایە بۆ وڵات مەترسیدار دەبێت بەڵام نەیدەتوانی نەهێڵێت تەواوی بکەن و مەسەلەی ڕووخاندنی بۆ دواڕۆژ هەڵگرت[١٣٩]. چونکە لەو کاتەشدا خەریکی قایمکردنی بەعلەبەک بوو.

پاشان هەواڵی زانی کە خاچپەرستەیل بەتەمای دەستدرێژیکردنن لە

---

١٣٦. سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، بەرگی ٨، ل.٣٤٢ مفرج الكروب، ٢/٦٠.

١٣٧. الكامل، ١١/٤٤٣. مفرج الكروب، ٢/٦٢.

١٣٨. رنسيمان، تاريخ الحروب الصليبية، ر/٢٧٣. Stevenson, p.200

١٣٩. ابو شامە، الروضتين، ٢/١٣. مفرج الكروب، ١/٧٢.

موسـڵمـانـان، بۆیە بۆیان چووره مـەیدان و لە نیـزیک (تل القـاضـی) لـە دەشـتـی مـەرجعیـون تووشـیان هات و بەگژیاندا چوو، لە ئـەنجامـدا هێزەکانـی سەلاحـەدین سەرکەوتن و هەندێ سەرلەشکر و سوارەی خـاچپەرست بەدیل گیران لەوانە پێش لەشکر "مـقدم"ی تیپی داویە و پێش لەشکری تیپی ئەسـپیتـاری و میری تەبەریە و جنین و یافا و برای حوکمڕانی جبێل و میری ڕەملە و کەسەیل تر، ژمارەی دیلەیل ٢٧٥ پیاو دەبوون، گوێزرانەوە دیمەشقی مۆڵگەی دیلان[١٤٠].

پاشـان سـەلاحـەدین چووەوە سـەر مـەسـەلەی قەڵای بـاسـکراو و هـەوڵی دا دوژمن ڕازی بکات بیرووخێنێ، لەجیاتی ئەمە گفتی پارەیەکی باشی پێیان دا، بەقسەیان نەکـرد، جـاری دووەم پارەکـەی زیاد کـرد، هـەر نەیانکرد، بۆیە بە هێـزێکی سوپاییەوە ڕووی لە قەڵاکە کرد و کەوتە تێکدانی[١٤١]. شووورەی قەڵاکەی کون کون کرد و ئاگری لە کونەکانـدا کردەوە و وازی نەهێنا هەتا شـووره و قـەڵاکـەی لەگەڵ زەوی یەکسـان نەکرد، دەردێکی وای بە خـاچپەرسـتان دا: هـەر بڕیارێکی دا دەبێ جێبەجێ بکرێت و هەر بەڵێنێکی دای لێی پەشیمان نابێتـەوە، شکانەکەی شـەڕی ڕەملەیش ڕووداوێکی لابەلایی بوو و زۆر شتی لێ فێر بوو[١٤٢].

دیاره کـاولکردنی قـەڵای (بیت الاحـزان) بەشـێک بوو لە نەخـشـەیەکی گشـتـیی سـەلاحـەدین بۆ هـەڵتـەکاندنی هـەموو سـەنگەر و قوللە و قـەڵا و هێـڵێکی بەرگریی دوژمن لە کەنـاراوی شـام و دەورووبەری قودس، وەکو قەڵای کەرک، شۆبەک یان لە باکور، وەکو قەڵای عـەجلون. بۆیە دەبیـنین سەلاحـەدین بایەخی بە قـەڵای کەرک دا کـە قـەڵایەکی سـەخت و گـرینگ بـوو، نەک هـەر لـەبەر قـایمیی بێ وێنەی، بگره لەبەرئەوەی کـۆسپ بوو لە ڕێگەی بازرگانیی نێوان مـیسر و شـامـدا، سـەرباری ئەوەش ئەرنات (رینو دی شاتیون)ی میری قەڵاکە لە هـەموو میره خاچپەرستەکان زیاتر ئازاری موسڵمانانی دەدا و پەیمانشکێنیی دەکرد، هەروەکو لەمەولا دەبینین. وەک ئەوەی کاتێک کە سەلاحەدین و بلدوینی چوارەمی مەلیکی قودس لە ئەنجامی

---

١٤٠. د. محسن محمد حسين، الجيش الايوبي، ل٢٢٨.

١٤١. الايوبي، مـضـمـار الحـقـائق، ٢٤-٢٦. سنا البـرق الشـامي، ١/٢٣٥. الكامل، ١١/٤٥٦-٤٥٧.

١٤٢. د. دريد عبدالقادر، سياسه صلاح الدين، ل٢٧٨.

قاتی و بێ بارانیی ساڵی ٥٧٨ک/ ١١٨٢ز ئاگربەستێکی دوو ساڵییان مۆر کرد.

ئەرنات وازی لە سیاسەتی بەدکارانەی خۆی نەهێنا و دەستی بەسەر ئەو کاروانانەدا دەگرت کە لە میسرەوە دەچوونە شام، سەرباری ئەوەش، هەوڵی دا هێرش بباتە سەر مەدینەی منەوەرە کە هەموو دنیای ئیسلامەتیی تۆقاند[١٤٣]. ئەمە بە دەرچوون لە برگەکانی ئاگربەستەکەی نێوان هەردوو لا حیساب دەکرێت، بۆیە سەلاحەدین سەیری کرد چار نییە دەبێ پەلاماری شاری کەرک بدات. ئەوە بوو لە ٥٧٩ک/ ١١٨٣ز بە هێزێکی شامی و هێزێکی میسری بەسەرکردایەتیی مەلیکی عادل سەیفەدین ئەبو بەکری برای، هێرشی برد بەڵام هەڵمەتەکە ئامانجی وەدەست نەهێنا لەبەر کەمیی ئەسپابی گەمارۆدان، ئەگەرچی سەلاحەدین حەوت مەنجەنیقیشی دانابوو شەو و ڕۆژ شوورەیلەکەی بەردەباران دەکرد، ئەم گەمارۆدانەی ئەمجارە سەرنەکەوت[١٤٤].

دواجار کە سەلاحەدین ویستی ئەم شارە زۆر قایمە بگرێت، ساڵی ٥٨٠ک/ ١١٨٤ز بوو، هەڵمەتێکی گەورەی لە ژمارەی شەڕوانان و لە تفاق و ئامراز، هەروەها لە ئاستی سەرلەشکرانیشدا ڕێک خست، هێزێکی میسری بە سەرۆکایەتیی تەقیەدین عومەر کوڕی شاهەنشای برازای و هێزێکی جزیرەیش بە سەرکردایەتی نوورەدین محەمەدی کوڕی قەرە ئەرسەلان[١٤٥]. هێزی سێیەمیش بە سەرکردایەتیی مەلیکی عادل ئەبوبەکری برای کۆ کردەوە.

هێزە هاوبەشەکان گەمارۆی کەرکیان دا و کوشتار گەرم بوو، موسڵمانان توانییان داوێنەکانی شار بگرن، بەڵام قەڵاکە نا، چونکە لە نێوان قەڵا و داوێنی شاردا خەرەندێکی شەست گەز پان هەبوو، سەلاحەدین فەرمانی دا بە بەرد و خۆڵ پڕی بکەنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا پەلاماردەرەیل نەیتوانی لە شوورەکە نێزیک ببنەوە، چونکە تیرباران و چەرخ و بەردەقانی و بەردی مەنجەنیقیان زۆر توند و بەتاو بوون. ئەمجا سەلاحەدین فەرمانی دا بە تەختە و بە خشتی کاڵ نێوانێک دروست

١٤٣. ابن جبیر، چاپی خانەی صادر - خانەی بەیرووت، بەیرووت ١٩٦٤، ل٣٤-٣٥. ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/١٠٢.

١٤٤. الكامل، ١١/٥٠٢, ابن العديم، زبده الحلب، ٣/٧٣.

١٤٥. الايوبي، مضمار، ل١٨٨. الكامل، ١١/٥٠٦.

بکەن بەژێریدا تێپەڕ بن و بگەنە خەرەندەکە تا پڕی بکەنەوە، ئەمەشیان کرد و هێندەی نەمابوو موسڵمانان دەست بەسەر شارەکەدا بگرن، بەڵام هیمدادێک گەیشتە خاچپەرستەیل، ئەوسا سەلاحەدین -جارێکی تر- دەستی لە گەمارۆدانەکە هەڵگرت و بەرەو نابلوس چوو، لەوێشەوە بۆ دیمەشق[١٤٦].

بەم جۆرە گرتنی کەرک سەری نەگرت، هەتا دوای شەڕی حەتین هەر بەدەست دوژمنەوە مایەوە، ئینجا دوای ئەو شەڕە و پاش گەمارۆدانێکی درێژ خاوەن سوپاکەی شار ئەمانی خواست، موسڵمانانیش ئەمانیان پێیان دا، ئیتر شاریان بەدەستەوە دا.

ئەو هەڵمەت و پەلامارانە پیشانی دەدەن کە سەلاحەدین لە ماوەی پێش شەڕی حەتیندا نەیویستووە بەگشتی بە گژ خاچپەرستاندا بچێت، بگرە ناوەناوە پەلاماری مەودا کەمی بردوەتە سەر هەندێ مۆڵگە و بنکەی خاچپەرستان لەلایەکەوە و جار بەجار ڕێککەوتنی شەڕ وەستانی لەگەڵ هەندێ هێزی خاچپەرست بەستووە، لەلایەکی ترەوە. ئەمەش بۆ ئەوەی بپەرژێتە سەر دارشتنی یەکەتیی هێزەکانی ئیسلام و کۆکردنەوەی کۆششەکانی هەموو لایەکان بۆ هێنانە دیی ئامانجی گەورە و پاکوەریی حیسابی داگیرکەرەیل.

بۆیە لەو قۆناغەدا کە ١٢ ساڵی خایاند خۆی تووشی شەڕێکی گەورەی یەکلاکەرەوە نەکرد، لە جیاتی ئەمە توانیی یەکەتیەکی بەهێز دروست بکات هەر لە میسرەوە تا سەرووی دیجلە، پێداویستییەکانی باری سیاسی و سوپاییشی بەتەواوی دابین کرد و باوەڕی گەلانی موسڵمانی بۆ خۆی وەدەست هێنا. ئەمجا هیچی نەما ئەوە نەبێ جاڕی غەزا بدا دژی دوژمنی داگیرکەر[١٤٧].

---

١٤٦. الکامل، ١١/٥٠٧. النوادر، ٦٦. المقریزي، السلوك لمعرفة دول الملوك، بەرگی ١، ل٨٤.

147. Lane-Poole, A History of Egypt in the Middle age, London, 1968, p.208.

## حەتین

سەلاحەدین سوپاکەی خۆی ڕێک خست و بەرەنگاری دوژمن بوو. بەلام پشووی شەڕوەستانی نێوان هەردوو لا لە گۆڕێ بوو، سەلاحەدین نەیدەویست دەستپێشکەریی پەیمان شکاندن بێت، بەلام ئەرناتی میری کەرک زۆری نەبرد پەیمانەکەی شکاند، هەروەکو پێشتر پەیمانێکی تریشی شکاندبوو.

ئەم میرە بە بێبەڵێنی و کەللەڕەقی و شەڕخوازی ناودار بوو، لە هەموو سەرکردە لاتینەکانی تر ملهوڕ و شەڕفرۆشتر بوو، دەستی لە ئازاردانی موسڵمانان نەدەپاراست[١٤٨]. زمانی عەرەبیشی دەزانی تا لە زمانی دوژمنانی خاوەن خاک بگات. کاتێک کە حوکمڕانی کەرک بوو چەند جار لای شار کاروانی ڕووت دەکردەوە و مەرجەیلی پەیمانی لەگەڵ موسڵمانان دەشکاند. کینە و داخ لەدڵی وای لێی کرد کەشتیگەلێک لە بەندەری ئیلە (ئیلات) لە سەرووی کەنداوی عەقەبە دابنێ و لە کەناراوەیلی حیجاز بەدکارییان پێ بکات و ئازاری حاجییان بدات. بۆیە سەلاحەدین سوێندی خوارد دەبێ بە کوشتن تۆڵەی ئەو بێئەقڵییەی لێ بسێنێ. هەر کردارەیلی ئەویش بوون کاریان کردە سەر هەڵگیرسانی ئاگری شەڕی حەتین.

لێرەشدا جێی خۆیەتی باسی ناتەباییی نێوان سەرکردە خاچپەرستەکان بکەین، بەتایبەتی ناکۆکییان لەسەر عەرشی مەملەکەتی بەیتول مەقدیس، چونکە ئەو ناکۆکییە کاری کردە سەر هەڵوێستیان و بووە هۆی جاڕدانی شەڕ دژی سەلاحەدین. ئەوەبوو کە مەلیک بەلدوینی چوارەمی مەلیکی قودس مرد، مەلیک بەلدوینی پێنجەم لە جێی دانیشت کە منداڵێکی نەساخ بوو، میر ڕیمۆندی میری تەرابلوس سەرپەرشتیی گرتە ئەستۆ، ئەمیش لەگەڵ سەلاحەدین لەسەر شەڕ ڕاگرتن بۆ ماوەی چوار ساڵ ڕێک کەوتبوو، بەلام لە هاوینی ٥٨٣ک/ ١١٨٦ز مەلیکی منداڵ مرد و ڕیمۆندی میری تەرابلوس لای وا بوو هەر خۆی دەبێ

---

١٤٨. فیلیپ حتی، العرب، چاپی پێنجەم، بەیرووت، ل٧٣٧.

میراتگری بێ و سەرپەرشتیی کاریاری حوکمڕانی بکات، بەڵام (سیبل)ی دایکی مەلیک بلدوینی پێنجەم پێی خۆش بوو عەرشی مەملەکەت بۆ مێردی تازەی بێت، واتا گی. دی. لوسینیان و کۆمەڵە میرێکیش پشتگیرییان کرد، ئەمیش تاجی لەسەر نا و بوو بە مەلیکی قودس. ڕیمۆندیش چووە تەبەرییە کە بووبووە موڵکی ئەشینای ژنی و وازهێنانی لە میرنشینییەکەی پێ باشتر بوو لەوەی لە ژێر فەرمانی مەلیکی نوێدا کار بکات.

بۆیە مەلیک تووڕە بوو و بڕیاری دا هێرشی بباتە سەر، بەو بیانووەی دەیەوێ لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکا لەبارەی پارە و سامانی مەملەکەتەوە، کە لەو سەردەمەدا سەرپەرەوەری مەلیک بووە لەبەر دەستیدا بوون. ڕیمۆندیش هانای بردە بەر سوڵتان سەلاحەدین کە ئەو دەمە لە بانیاس بوو و دژی مەلیکی قودس دنەی دا. بەڵام سەلاحەدین بەو بیانووەی کە نایەوێ بەڵێنی شەڕ ڕاگرتن بشکێنێ دەستی نەدایە چەک. واش پێ دەچێ ویستوویەتی ماوەی زۆرتر بێت و چاوەڕوانی گەورەبوونی کەلێنی ناکۆکیی نێوان سەرکردە خاچپەرستەکان بکات و ئەوسا دەستێکی باشیان لێ بوەشێنێ.

ئەو دەرفەتە چاوەڕوانکراوەش ئەو دەمە هەڵکەوت کە کاروانێکی گەورە بە بار بارگە و شتومەکی زۆرەوە -وەکو باسمان کرد- لە میسرەوە بەرەو شام کەوتە ڕێ و بە باشووری فەلەستیندا تێ پەڕی. خەڵکی کاروانەکە بێ ترس بەڕێدا دەڕۆیشتن و لە بەڵێنی هەردوو لا دڵنیا بوون، بەڵام ئەرنات هەڵی کوتایە سەر کاروانەکە و تاڵان و کوشت و بڕی تێ خست و هەندێکیشی لە کاروانچییان بەدیل گرت، کە ئەم هەواڵە بە سەلاحەدین گەیشت ئێجگار تووڕە بوو و زانیی مەلیکی قودس دەسەڵاتی جڵەوکردنی ئەرناتی لەدەست نەماوە، بۆیە بڕیاری دا بجووڵێ و جارێکی تر سوێندی خوارد کە ئەگەر میری کەرکی دەست بکەوێت دەبێ بەدەستی خۆی بیکوژێت. ئەم کەتنە بووە مایەی هەڵگیرسانی ئاگری شەڕێک کە پاش بەستنی پەیمانێکی تازە و پاش شەش ساڵان نەکوژایەوە.

سوڵتان لە دیمەشق بوو، سەرەتای ساڵی ٥٨٣/ بەهاری ١١٨٧ز، بەدوای هەموو میری هەرێمەیلی وەکو موسڵ، دیاربەکر، جزیرە، هەولێر و ناوچەیلی شام و میسریدا نارد کەوا بڕیاری غەزای داوە و دەبێ خۆیان و سوپایان بێن شەڕ دژی ئەرنات بکەن. میرەیل هەموو بە جارێ وەڵامی سازبوونی خۆیان دایەوە و لە هەموو

لایەکەوە ڕژانە دیمەشق کە بووە مەڵبەندی سەرکردایەتیی باڵای شەڕکەرەیل.

سەرکردە ئەو هێزانەی کرد بە دوو بەشەوە، بەشێکیان خۆی سەرکردایەتیی کرد، بۆ تەمێکردنی ئەرناتی کەلەڕەق و پاراستنی ڕێی کاروانی حاجییان و کاروانی بازرگانی لە میسرەوە هاتوو بۆ شام. دوای ئەوەی ڕێی حاجییانی تەئمین کرد، فەرمانی دا هەرچی داری دەوری کەرک هەیە بیبڕن و ڕەز و باخەیلی وێران بکەن بۆ ئەوەی دوژمن سوودی لێ وەرنەگرێ. پاشان ڕووی کردە شوبەک و هەمان کاری لەوێش کرد[149]. بەشی دووەمی هێزەیلیشی، خۆی سەرکردەی بۆی هەڵبژارد و بە سەرکردە گەورەکانی سپارد، وەکو مزەفەرەدین گۆکبەریی سەروەری حەڕان، بەدرەدین دلدرم کوڕی یاروقی میرعەسکەری حەلەب، سارمەدین، قایمازی نەجمی میرعەسکەری دیمەشق، هەمووی بەرەو عەکا ڕەوانە کرد بۆ ئەوەی ڕێ لە دوو تیپەکەی خاچپەرستان (داوییە و ئەسپیتاری) بگرن کە بە هیمدادی حوکمڕانی کەرک دەچن، هەروەها هەڵبکوتنە سەر موڵک و سەربازگەکانی دوژمن و بێهێزی بکەن و نەخشە و پیلانەیلی ئاشکرا بکەن. ئەم هێزانە چوونە نێزیک سەفوورییە[150].

سەرلەشکرەیل هەوڵیان دا بە شەو، زۆر بە نهێنی بەڕێ بکەون و نەهێڵن دوژمن بە جموجووڵیان بزانێت و بەرەبەیانێکی زوو بگەنە ئەوێ و پەلاماری دوژمن بدەن، بەڕاستیش بە وردی نەخشەکەیان بەجێ هێنا[151]. دوژمن کاتێ بەخۆی زانی پەلامار دراوە و ماوەی ئەوەی نەبوو بتوانێ خۆی کۆ بکاتەوە. هەردوو لا داڕسانە یەک، شەڕێکی توند و بەتاو قەوما، ئەنجام موسڵمانەیل سەرکەوتن و زۆربەی خاچپەرستان کوژران و بەدیل گیران، هەتا پێش لەشکری ئەسپیتاریش و سوارە بەناوبانگەکانیان کوژران و پێش لەشکری داویە بە پەلەپرووزە خۆی پێ ڕزگار کرا[152].

---

۱٤۹. ئیبن ئەسیر، ۱۱/٥۳۰. ابن واصل، مفرج الكروب، ۲/۸٦.

۱٥۰. سەفوورییە، ناوچە و شارێکە لە ئوردن، دەکەوێتە نێزیک تەبەرییە. معجم البلدان، ۳/٤۱٤.

۱٥۱. الروضتین، ۲/۱۸۷.

۱٥۲. سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە. ابن واصل، مفرج الكروب، ۲/۱۸۷.

ئەوەی زیاتر خاچپەرستەیلی شڕ کرد ئەوە بوو هێزێکی خاچپەرست بەپەلە بە هیمدادی براکانیانەوە هاتن. کاتێک گەیشتن شەڕەکە تەواو بووبوو. ئەوسا موسڵمانان تێکڕا دەستبەسەریان کردن و گرتیانن. موسڵمانان لەو شەڕەدا بەسەرکەوتوویی و دەستکەوتێکی باشەوە گەڕانەوە.

ئەم سەرکەوتنە وەکو "نۆبەرەی بەرەکەت و سەرەتای فەڕ و جمان بوو" هەواڵی سەرکەوتنەکە لە نێزیک شاری کەرک و شۆبەک بە سەلاحەدین گەیشت و بەم مزگێنییە دڵشاد بوو. زوو ئەم ناوچەیەی بەجێ هێشت و بەرەو (عەشترا) چوو کە ناوچەیەکە سەر بە دیمەشقە[153] و هێزەیلی ئیسلامی لەدەوردا کۆ بووبوونەوە. پاش ئەوەی کەمێک حەسانەوە، سەلاحەدین لەشکری دامەزراند و ژمارەی کردن کە ۱۲ هەزار شەڕکەری نیزامی بوون[154]. پاشان لاباڵەیلی سوپای ڕێک خست و سەرلەشکرە گەورەکانی خۆی لەسەر هەردوو لاباڵی بنەڕەتی دانا، برازاکەی خۆی تەقیەدین عومەری کوڕی شاهەنشای لەسەر لاباڵی ڕاست و مزەفەرەدین گۆکبەریی مێردی خوشکی خۆیشی لە ناوەند دانا[155].

کە خاچپەرستان هەواڵی کۆکردنەوەی ئەو هێزە زۆرەیان لە عەشترا زانی، هەرا و ناکۆکیی نێوان خۆیان واز لێ هێنا و فەرمانیان دا سوپا گرد بکەنەوە، ئەوجا میر ڕیمۆند لەگەڵ مەلیک گی دی لوسینیان ئاشت بووەوە، پاشان مەلیک فەرمانی خۆسازدانی گشتیی دا و لە مەترسیی بارەکە گەیشت، چونکە هەتا ئێجگار پێویست نەبوایە وایان نەدەکرد.

گشتیان لە سەفوورییە گردبوونەوە و خاچی (سەڵبوت)یان دەرهێنا و بەرزیان کردەوە تا خەڵک لە دەوریدا کۆ ببنەوە. ژمارەی هێزەیلی خاچپەرست بە ۲۰ هەزار کەس دانراوە[156]. ئەگەرچی سەرچاوە عەرەبییەکانی هاوچەرخ ژمارەی

---

۱۵۳. عەشترا، شوێنێکە لە ناوچەی دیمەشق. معجم البلدان، ۱۲۵/٤.

۱۵٤. الکامل، ۱۱/۵۳۱. الروضتین، ۲/۷٦. ابن واصل، مفرج الکروب، ۲/۱۸۷.

۱۵۵. ابو شامە، لە مێژوونووسی هاوچەرخ محمد بن القادسی وەرگرتووە. الروضتین، ۲/ ۸۲.

۱۵٦. د. الباز العرینی، الشرق الادنی فی العصور الوسطی، دار النهضة العربیة للطباعة والنشر، بیروت ۱۹٦۷، ل۸٤.

شەڕکەرەیلی خاچپەرستیان گەلێ لەو ژمارەیە زیاتر داناوە[١٥٧].

هەواڵی گردبوونەوەی سوپای گەورەی خاچپەرست بە سەلاحەدین گەیشت، ئەویش لەگەڵ سەرلەشکر و میرسوپایەلی خۆیدا کەوتە ڕاوێژ و پرس و ڕا، ئاخۆ لەو دۆخە ناسکەدا چی بکەن باشە؟ هەندێ گوتیان با لەسەر پلانی هێرشی ناکاویی مەوداکەم بڕۆین هەتا تەواو بەهێز دەبن. بەلام سەلاحەدین وای بەچاک زانی کە پەیرەوی پلانی هێرشی فرەوان بکەن و لەگەڵ دوژمن بیکەنە شەڕێکی یەکلاکەرەوەوە.. چونکە بە زیرەکیی خۆی زانیی کە زۆربەی ئەو هێزانەی لەلای کۆ بوونەوە لە ناوچەی دووری وەکو میسر و موسڵ و هەولێر و دیاربەکر و حەلەب و شوێنی ترەوە هاتوون، پێویستە سەرگەرمی و گوڕی تەکان و هێرشی بەتەوژمیان سارد نەبێتەوە، لەلایەکی ترەوە ئەو عەسکەرەیلەی سیستمی (ئەقتاعی حەربی)[١٥٨] پەیرەو دەکەن لە زەوی و زار و کێڵگەکانیاندا کاربار و بەرپرسیارییان هەیە و لەوانەیە کار بەوە بگات داوای ڕوخسەت لە سەلاحەدین بکەن و بچنەوە ولاتی خۆیان بۆ ئەوەی پێداویستییەکانی بەڕێچوون جێبەجێ بکەن. سەرباری ئەمەش سەلاحەدین ویستی سوود لە ناکۆکی و هەرای نێوان خاچپەرستەیل خۆیان وەربگرێت، کە دوای مردنی مەلیک بلدوینی پێنجەم و تاج لەسەر نانی گی دی لوسینیان، بووە هۆی ئەوەی هەردوو میرنشینییەکەی ئەنتاکیا و تەرابلوس یارمەتیی مەملەکەتی قودس نەدەن[١٥٩].

کە وا بێت هەردوو لا بەتاسەوە چاوەڕوانی ڕووبەڕووبوونەوەی یەکتر بوون، هەر یەکێکیشیان چاوەڕوانی پەلاماری دوژمنەکەی دەکرد، بەلام سەلاحەدین لەوە ئاگەدار بوو کە کۆبوونەوەی هێزەیلی دوژمن بەو چڕییە لە سەفوورییە سەرپشکییان دەداتە دەست و ئەگەر لەم شوێنەدا بەگژ یەکدا بچن و بیکەنە شەڕێکی یەکلاکەرەوە، لەوانەیە دەستی خاچپەرستان بەسەر موسڵمانەکاندا زاڵ بێت، چونکە سەفوورییە شوێنێکی پڕ لە ئاو و لەوەڕ و ڕەز و باخە بۆ دامەزراندنی ئۆردوگای سوپایان زۆر چاکە. بۆیە بیری لەوە کردەوە پلانێک دابنێ بتوانێ بە

---

١٥٧. العماد الكاتب، الفتح القسي، ل٧٤. الروضتين، ٢/٧٦.

١٥٨. د. محسن محمد، الجيش الايوبي، ل١٢٩-١٤٣.

١٥٩. د. سعيد عبدالفتاح عاشور، الحركة الصليبية، ٢/٧٩٩.

هۆیەوە لەو جێیە هەڵیان بکەنێ و بیانهێنێتە جێیەک خۆی هەڵیبژێرێت و بیکاتە مەیدانی شەڕ. سەرباری ئەمەش هەڵکەندنیان لە سەفوورییە و گواستنەوەیان بۆ شوێنێکی تر و جووڵانەوەیان، وا دەکا بە ماندوویی بگەنە جێی تازە، لە کاتێکدا ئەو خۆی و سەربازەیلی حەساوەن[١٦٠]. بۆیە نەخشەی ئەوەی ڕێک خست کارێک بکات خاچپەرستان لە سەربازگەی سەفوورییە دوور بکەون و بەبێ ئاگا، بێنە ئەو جێیەی کە بۆیانی ساز کردووە. ئەمجا پاش بیر و لێکدانەوە، بڕیاری دا بۆ بزواندنیان پەلاماری شاری تەبەرییە بدات.

بەلام بۆچی لەناو هەموو شاران سەلاحەدین ئەم شارەی هەڵبژارد؟

وەلامەکەی ئەوەیە، سەرکردەی شارەزای دنیادیتە زانیی کە ژن و منداڵەکانی ڕیمۆندی میری تەرابلوس لە تەبەرییەن، ئەمە وا دەکات میر ئۆقرەی لێ هەڵبگیرێت چونکە بەوە ناسراوە زۆر هۆگری ژنەکەیەتی.

لای تەبەرییەش، سەلاحەدین و ڕاوێژکارانی بە وردی جێیەکی وایان هەڵبژارد کە مۆڵگەکانی سوپا خێوەتی لێ هەڵبدەن، کە سەربازان دەتوانن ڕێگەی بەرەو تەبەرییە بگرن، لە هەمان کاتیشدا ئەو ڕێیانەی کە لە داوێنی دەستی ڕۆژهەلاتەوە بەرەو تەبەرییە دەچن و دەگەنە ئاو، لەدەستی خۆیاندا دەبێت[١٦١]، خاچپەرستانیش کە لە سەفوورییەوە دێن و ڕووبەڕووی هێزەکانی سەلاحەدین دەوەستن لە ناوچەیەکی وشکی بێ ئاودا گیر دەبن[١٦٢].

پاش ئەوەی سوپای موسڵمانەیل شاری تەبەرییەیان گرت، هێزی ژنە سەرەری شار لە قەلاکەیدا خۆی قایم کرد، وا دیارە سەلاحەدینیش نەیویستووە هێرش بباتە سەر قەلاکە، بۆ ئەوەی ڕێگە بە دوژمن بدات بێنە ناوچەکە. میرژنیش داوای هیمدادی کرد و نوێنەرێکی نارده سوپاگەی خاچپەرستان، داوای لێیان کرد هەتا زووە فریای بکەون. ئەودەم مەلیک گی دی لوسینیان دووبارە ئەنجوومەنی میرانی کۆ کردەوە و حاڵەتەکەی بۆ باس کردن، کەوا میرژن دوای ئەوەی موسڵمانان شاری تەبەرییەیان گرتووە خۆی لە قەلاکەی قایم کردووە و شێرانە بەرگری

---

١٦٠. د. سعيد عبدالفتاح عاشور، الحركة الصليبية، ٢/٨٠٤.

١٦١. د. السيد الباز العريني، الشرق الادني في العصور الوسطي، ل٨٧.

162. Lane-Poole, Saladin, p.206

دەکات. سەرکردە خاچپەرستەکان گوتیان پێویستە فریای بکەوین. بەڵام ڕیمۆند گوتی با چاوەڕان بین، گەوجییە سەفوورییە چۆڵ بکەین و لە قرچەی گەرمای تەمووزدا لە پاڵ گردێکی ڕووتەندا خۆمان تووشی مەترسی بکەین. هەروەها گوتی تەبەرییە شاری خۆمە و وا ژنەکەم بەرگریی لێ دەکات، من وام لا چاکترە تەبەرییە و هەرچیی تێدایە لەدەست بچێت نەک مەملەکەتی خاچ لەدەست بچێت. ئەم قسانەی ڕیمۆند بەڵگەی سەلماندنیان پێ بوو، لە نیوەشەودا بەشدارەیلی جڤات هەستان دوای ئەوەی بڕیاریان دا لە سەفوورییە بمێننەوە[١٦٣].

ڕۆژی دواتر هەندێ باروون و پێش لەشکری تیپی داوییە توانییان کار بکەنە سەر مەلیک (گی)ی دوودڵ. ئەویش بڕیاری خۆی گۆڕی و ڕای گەیاند، لە بەرەبەیاندا بە نهێنی سوپا بەرەو تەبەرییە بەڕێ دەکەوێ. هەواڵی بزووتنی دوژمن بە سەلاحەدین گەیشت و زانیی ئەوە بەرەو لای ئەو دێن، بۆیە سوپاکەی لە ڕێی گردەکانەوە نزیکەی پێنج میل بردە پێش هەتا گەیشتە حەتین کە لەوێوە ڕێیەک بەرەو گۆمی تەبەرییە شۆڕ دەبێتەوە. حەتینیش گوندێکی بەئاو و لەوەڕگەیە، هێزێکی کەمیشی بۆ گەمارۆدانی تەبەرییە جێ هێشت.

ئەو ڕۆژە ئێکجار گەرم بوو و هەوا وەستابوو، لە سبەینەی ئەم ڕۆژە پیرۆزەدا، کە ڕۆژی هەینی ٢٤ی ڕەبیعول سانی ٥٨٣ک/ ٣ی تەمووزی ١١٨٧ز، بوو سوپای دوژمن مێرگەکانی سەفوورییەی بەجێ هێشت و بەسەر گردە ڕووت و وشکەکاندا ڕێی بڕی، ڕیمۆندیش بەو پێیە کە مێردی ژنە سەروەری تەبەرییەیە سەرکردایەتیی سوپای گرتە دەست. مەلیک گی دی لوسینیانیش لە سەرکردایەتیی ناوەندی سوپای ڕینو دی شاتیونی ئەرنات و سوارە ڕاهیبییەکان و مابیان ئەبلین لە سەرکردایەتیی دواوەی سوپادا بوون.

لەبەر نەبوونی ئاو، کە پیاوەیلی سەلاحەدین هەرچی بیر هەیە لەسەر ڕێگە هەموویان پڕ کردبووەوە، زۆری نەبرد تینووەتی زۆری بۆ پیاوان و ئەسپەکانیان هێنا، بۆیە ڕاو و ڕەوتیان خاو کردەوە، ئەوجا تیرهاوێژانی سەلاحەدین کە بە درێژاییی ڕێ خۆیان لە بۆسە دانابوو، کەوتنە پەلاماردانی سوپای خاچپەرست بەتایبەتی پێشەنگەکەی، پاشان ناوەندی سوپاشیان تیرباران کرد، گورج و

---

١٦٣. رنسيمان، تاريخ الحروب الصليبية، ٢/٧٣٦.

لەناکاو، بەر لەوەی ماوە بدەن فەڕەنگ دەست بکەنەوە.

پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، هێزە هێرش هێنەکەی فەڕەنگ گەیشتنە سەر ئەو بانەی کە یەکسەر دەڕوانێتە سەر حەتین، لە بەردەمیشیاندا گردێکی بەردەلان هەبوو بە دوو لووتکەوە، کە بەرزاییی نێزیکەی ١٠٠ پێ (نێزیکەی ٣٠ مەتر) دەبوو، لە پشتەوەشی بە نشێوێکی زۆر لێژ دەگەیشتە تەبەرییە، ئەم جێیەش بەناوی قۆچە شاخی حەتین بەناوبانگ بوو. مەلیک بڕیاری دا ئەم شەوە هێزەکانی خاچپەرست بحەسێنەوە چونکە زۆر ماندوون، ئەگەر چی هەندێ سەرکردە داوایان کرد نەوەستن هەتا دەگەنە تەبەرییە. ئیتر ئەو شەوەیان ئیجگار ناخۆش بەسەر برد، لەشکری سەلاحەدینیش لە دۆڵە سەوزە پڕ گیاکەی خوارووی گردەکەدا دامەزرابوو، سەلاحەدین بەوەی بەسەر هێزەکانی دوژمندا هات کەیفخۆش بوو، زانیی کە ئەو هەلەی ئاواتی بوو، وا هات و بەشادییەوە بانگی هەڵدا: "ئەوەی دەمانویست بۆمان هات"[١٦٤] و، نەخشەکەی بۆ فریودانی دوژمن و تێکەوتنی لەو بارە بێ هیوایەدا سەرکەوت، سەربازەکانیشی ئەم شەوەیان بە دڵێکی خۆش بەسەر برد، نوێژ و نزایان دەکرد و لە خوا دەپاڕانەوە بەسەر دوژمنی داگیرکەردا زاڵیان بکات. کە دەنگی زیکر و دوعایان دەگەیشتە سوپاکەی خاچپەرستان، زیاتر پەست و نائومێدی دەکردن، سات دوای سات باری دەروونیان بێ هێزتر دەبوو و تینووەتی شێتی کردبوون، هەتا کۆمەڵە سەربازێک لە سوپاکەیانەوە دەرپەڕین بەڵکو خۆیان بگەیەننە ئاو، بەلام ڕەنجیان بەبا چوو، هەندێکیشیان کە ویستیان هەر چۆنێک بێت بگەنە ئاوەکە، بەدەستی موسڵمانان هاتنە کوشتن.

موسڵمانەیل بۆ ئەوەی زیاتر دوژمن هیلاک بکەن، تیپێک بە سەرۆکایەتیی مزەفەرەدین کۆکبەری ئاگریان لە پووش و چیلکە و هەژگەلی گردەکە بەردا، ئەمجا دووکەڵ و بڵێسەی ئاگر و گەرما بەناو سوپاکەی خاچپەرستاندا بڵاو بووەوە و بووە هۆی شپرزەبوونی سەربازان و توندکردنی تینووەتی و گەرماییان[١٦٥].

ڕۆژ ڕۆژی هەینی بوو، سەلاحەدینیش بەردەوام بۆ غەزاکانی ئەم ڕۆژەی هەڵدەبژارد، چونکە لەو ڕۆژەدا لە مزگەوتاندا نوێژ و نزا بۆ سەرکەوتنی

---

١٦٤. العماد الكاتب، الفتح القسي، ص٧٧. الروضتين، ٢/٧٧.

١٦٥. ابن الأثير، الكامل، ١١/٥٣٥. ابن العديم، زبدة الحلب، ٣/٩٤. الروضتين، ٢/٧٧.

موسڵمانان دەکرێت، درەنگانێکی شەو سەلاحەدین سەربازانی بزواند، لەگەڵ گزنگی بەرەبەیانی ڕۆژی شەمەوو ٤ی تەمووزی ١١٨٧دا دەوری سوپای مەلیکی قودسی گرت و هیچ کەس نەیدەتوانی لەو داوە ورد و ئەقڵکردمیە ڕزگاری بێت.

خاچپەرستان لەخۆ بردووانە هەوڵیان دا موسڵمانان بشکێنن، چەند جار توانییان موسڵمانان بکشێننە دواوە، بەڵام هەوڵ و تەقەلایان بەرە بەرە سست دەبوو و ژمارەی بەرگریکەرانیان کەم بووەوە، دوای ئەوە گەرما و تینوەتی هەراسانی کردن خەریک بوو بڕوخێن. لەسەر خواستی مەلیک، بەر لەوەی کار لەکار بترازێ و لە تینوێتیدا بخنکێن، ڕیمۆند سەرکردایەتیی سوارەکانی خۆی کرد و تەکانی دا بە زەبری باز و درِ بە موسڵمانان بدات و بگاتە ئاو. تەقیەدین عومەر لێی گەڕا کەلێنێک بدۆزێتەوە و لێی تێ پەڕێت، هەر کە پەڕییەوە تەقیەدین فەرمانی دا کەلێنەکە بگرن، ئیتر ڕیمۆند و هەڤاڵانی نەیانتوانی بگەڕێنەوە لای کۆمەڵی خۆیان، جا کە بێ هیوا بوون گەڕانەوە تەرابلوس، دەرچوونیشیان لە بازنەی گەمارۆدانەکە فێڵێک بوو تەقیەدین عومەر کردی بۆ ئەوەی بەڕاکردنی ڕیمۆند ژمارەی شەڕکەران کەم بێتەوە و دوژمن بێهێز بێت، لە ڕاستیشدا پاش ئەوەی ڕیمۆند ڕای کرد، سەرشۆڕیی خەم دای گرت، چونکە وازی لە هاوڕێیان و لە مەسەلەی فەلەستین هێنا، ئیتر پاش چەند ڕۆژێک مرد، پاشان لە دواییدا بالیان ئەبلین و ڕینالدی سەرۆەری سەیداش چوونە ڕیزی ڕاکردوومیل. خاچپەرستان تەنیا تروسکە هیوایەکی سەرکەوتنیان مابوو و نەمابوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەر شەڕیان دەکرد، هەتا کشانەوە سەر دوو لوتکەی گردەکە کە بە قۆچە شاخەکانی حەتین ناسراوە، خێوەتی سووری مەلیکیان بردە ئەوێ و لە سەرووی لوتکەدا هەڵیان دا و سوارچاکانی خاچ لە دەوری مەلیک کۆ بوونەوە و جەنگاوەرانیان لە بەرزاییی ئەم گردەدا چالاکانە بەرگرییان لە خۆیان دەکرد، موسڵمانەکانیش تاو نا تاوێک هێرشیان دەبردە سەریان.

مەلیکی ئەفزەڵ نوورەدین عەلی، کوڕی سەلاحەدینیش، کە ئەمە یەکەم شەڕ بوو لە ژیانی خۆیدا بینیبووی، لە شەڕەکەدا لە تەک باوکیدا وەستابوو، پاشان بینینەکانی خۆی لە جەرگەی شەڕدا گێڕاوەتەوە و باسی لەخۆبردوویی شەڕکەرەیلی هەردوو لای کردووە، کە چۆن بێ و چەند شەڕیان کردووە و لە دواییدا موسڵمانان سەرکەوتن. ئەو دەمە ئەفزەڵ سێ جار هاواری کردووە

(ئەوانمان بەزاند) و کاتێک کە خێوەتی مەلیک کەوت باوکم -ئەو گوتەنی- لە ئەسپ دابەزی و کڕنۆی سوپاسی بردە بەر خوا و لە خۆشییا گریا[١٦٦].

١٦٦. ابن الأثير، الكامل، ١١/٥٣٦.

## له چادری سەرکەوتندا

خاچی (سەلبووت)- کە لایان وایە عیسا پێغەمبەری لەسەر لە خاچ دراوە- قەشەی عەکا هەڵی گرتبوو، کە کوژرا کەوتە دەست موسڵمانان، شەرکەرانی موسڵمانان بە لووتکەی گردەکەدا سەرکەوتن، سەیریان کرد سوارچاکانی خاچپەرست، لەناو ئەوانیشدا مەلیک گی دی لوسینیان لەوێ پالاوپاڵ کەوتوون و ماندوویی و تینوومتی پەکی خستوون. هەموو لەسەر خاک دانیشتوون و جووڵەیان لێ براوە، تەنانەت تاقەتی ئەوەشیان نەبوو، هەروەکو نەریت وا بوو شیرەکانیان بدەن، ئەمجا سەرکردەکانیان هەڵگرت و بردیانە خێوەتێک کە بۆ سوڵتانی سەرکەوتوو لە مەیدانی شەڕدا هەڵدرابوو. سەلاحەدین لە چادرەکەی دانیشت و سەرکردە بەزیوەکانیان هێنایە لای، لەوانە مەلیک گی و براکەی و ڕینو دی شاتیون و گەلێکی تر. لەبەر هەستی مرۆڤایەتی و دەروون بەرزی، سەرکردە پەرداخێک ئاوی سارد، هەندێ سەرچاوەش دەڵێن بەفراوی گوڵاوداری دا بە مەلیکی تینوو.

مەلیک هەندێکی لێی خواردەوە و پاشان دایە ئەرنات کە لە تەنیشتی دانیشتبوو، بەلام بەپێی دەستووری میوانداری هەر کاتێک خواردن و خواردنەوە پێشکێشی دیل کرا مانای لێ خۆشبوون و پاراستنی ژیانی دەگەیەنێت. بۆیە سەلاحەدین بە تەرجومانەکەی گوت بە مەلیک بڵێ خۆی شەربەتی داوەتە ئەو پیاوە و ئەو "واتە سەلاحەدین" نەیداوەتێ، پاشان ڕووی کردە ئەرنات، کە گەلێ تاوانی لە نەریت و لە دین بەدەری دژی موسڵمانەیل کردبوو، تاوان و بەدکاری و پەیمانشکێنییەکانی ژمارد، پێشانی دا کە لەسەر دەستووری هەردوو دین ناڕوات، سەرباری ئەوە کە ڕێی بە حاجییان گرتووە و گاڵتەی بە پێغەمبەری ئیسلام کردووە. سەلاحەدین پێی گوت: ئەوەتا من لەسەر محەمەد دەکەمەوە.

پاشان پێی گوت موسڵمان بە.. سەرکردەی دیلی دڕ کەللەشەقانە و بەقسەی

ترن وەڵامی دایەوە، بۆیە سوڵتان شیرە کورتەکەی "نیمجاە"ی هەڵکێشا، شیرێکی ڕاوەشاندێ لا شانێکی ترازاند و داوای لە پاسەوانانی کرد تەواوی بکەن، ئیتر کوشتیان، مەلیک لە ترسان هەترەشی چوو و وای زانی ئێستا نۆرەی ئەویش دێ تۆڵەی لێ بستێنن، بەڵام سوڵتان هێوری کردەوە و پێی گوت: مەلیک مەلیکێکی دیل ناکوژێت، بەڵام ئەوەی ئەرنات کردوویەتی هەموو سنوورێکی ستەمکاریی تێ پەڕاندووە. پاشان فەرمانی دا دەستدرێژی لە دیلەکان نەکەن و ڕێزیان بگرن، تەنیا سوارەی داوییە و ئەسپیتاری نەبێ کە بیانکوژن و کوشتنی ئەوانیشی بە دەروێش و سۆفییەکان سپارد.

دیلەکانی تر، گوێزرانەوە دیمەشق کە چەند ساڵێک بوو بووبووە مۆڵگەی دیلان- هەرەکو باسمان کرد- و بڕیار درا دیلە هەژارەکان بفرۆشن، لەبەر زۆریی ژمارەیان نرخی دیل زۆر هەرزان بوو، کەوا هەر سەرێک کەوتە سێ دینار، ئەمە لەبارەی دیلەوە، لەبارەی کوژراوانیشەوە ژمارەیان لە ژمارەی دیل کەمتر نەبوو، ئەوەندە زۆر بوون ئیبن ئەسیر دەڵێ هەر کەسێک کوژراوانی دیتبا وای دەزانی کەس دیل نەکراوە، ئەوەی دیلەکانی دیتبا وای دەزانی کەس نەکوژراوە[١٦٧].

خۆ پێشتریش خاچپەرستان تووشی شکان و نەگبەتی هاتبوون و مەلیک و میرانیان بەدیل گیرابوون، بەڵام لە دوو قۆچەکانی حەتیندا گەورەترین سوپای خاچپەرست کە مەملەکەتی بەیتول مەقدیس و میرنشینی تەرابلوس و تیپی داویە و ئەسپیتاری و هی تر پێکیان هێنابوو تێک شکا کە لە ڕۆژی دەستدرێژیی خاچپەرستییەوە هەتا ئەو ڕۆژە سوپای وا گەورە پێک نەهاتبوو. هەر لە حەتیندا خاچپەرست پیرۆزییان لەناو چوو، سەرکەوتووش هەموو دنیای ئیسلام بوو[١٦٨].

هارولد لامپ دەڵێ: کام وڵاتگری ئاسیایی وەک سەلاحەدین تامی سەرکەوتنی کرد؟ نە ئەحشاریش (مەلیکی فارسی کوڕی دارای یەکەم ساڵی ٤٨١ی پێش زاین پەلاماری یۆنانی دا و ئەسپارتەییەکانی بەزاند) نە مەحموودی غەزنەوی دامەزرێنی

---

١٦٧. سەرچاوەی پێشوو.

١٦٨. رنسیمان، تاریخ الحروب الصلیبیة.

دەوڵەتی غەزنەوی و داگیرکەری هیندستان؟ سەلاحەدین پاش حەتین کەوتە ڕامان و لە مانای ئەو سەرکەوتنە سەرسووڕێنە ورد بووەوە کە دەرگە کردنەوەی بەرەکەتی دەسکەوتی گەورەترە[١٦٩].

١٦٩. هارۆلد لامب، شعلة الاسلام، قصة الحروب الصليبية، لە بڵاوکراوەکانی دەزگەی فرانکلین و خانەی موتەنەبی، بەغدا ١٩٦٧، ل. ١١٤

## وەرگرتنەوەی هەموو فەلەستین

سەلاحەدین پاش ئەوەی کۆڵەکەی سوپای گەورەی خاچپەرستی تێک شکاند، هەر ئەوەی ما بەرەو شوورە و قەلای هێزەکانی خاچپەرست بچێت لە فەلەستیندا، بۆیە ڕۆژی دوایی یەکسەر ڕووی لە تەبەرییە کرد، ژنە سەروەری شار بەبێ بەرگری خۆی بەدەستەوە دا، سەرکردەی ڕەوشت بەرز ڕێی بە خۆی و بەدەست و پێوەندانی دا کە لە شار دەربچێت و بگاتە مێردەکەی لە تەرابلوس. سەلاحەدین چاوی بڕیبووە عەکا، بۆیە زۆربەی سوپاکەی لە ٨ی تەمووزی ١١٨٧ز دا بۆ ئەوێ نارد، سەروەری عەکا (سەنجیر: جوسلین کورتینای) زانیی بەربەرەکانەی سەلاحەدین بێ کەڵکە، بۆیە نوێنەرێکی ناردە لای و پێی گوت سازە شاری گەورە بەدەستەوە بدات بە مەرجێک نیشتەجێ فەرمنگەکان و سامانیان پارێزراو بێت، سەلاحەدین ڕازی بوو و لە ١٠ی تەمووزدا عەکای گرتە دەست و خاچپەرستان بە خۆیان و سامان و زیندەماڵیان لە شار دەرچوون، بەلام شتومەکی بازرگانیی وەکو کان (مەعدەن) و ئاوریشم و چەک و گەوهەر، ئەوەی پێیان نەچوو بەجێیان هێشت و بووە تالانی بۆ سەربازانی سەرکەوتوو، مەلیکی ئەفزەڵ عەلیی کوڕی سەلاحەدین کارباری شاری هەڵسووڕاند. دوای ئەمە گەلێک سەرکەوتنی تری وەدەست هێنا لە کەناراو و لە ناوەوەدا، شار و قەلاکان ملکەچ بوون، ئەگەر چی هەندێکیان چەند ڕۆژێک بەرگرییان دەکرد. مەلیکی عادل ئەبو بەکری برای، لە میسرەوە هات و شاری یافای گرت، بەلام هێزمیلی سەلاحەدین لە سووری سەر کەنار زەریا بەرگرییەکی توند و تیژیان تووش هات، ئەم شارەش سوپایەکی گەورەی هەبوو، شوورەکانی بەهێز و شوێنەکەی قایم بوو چ لە وشکانی و چ لە دەریادا. پاشان ڕووی کردە سەیدا کە بەبێ بەرگری خۆی بەدەستەوە دا، دوای ئەوەی حوکمڕانەکەی ڕای کردە قەلای قایمی (شەقیف ئەرنون) کە لە ناوەوەی ولاتە. پاشان بەیرووت و جبێلیشی گرت.

مانگی ئابی ١١٨٧ تێپەڕ نەبوو هەتا خاچپەرستان هەموو پەنایەکیان لە

باشووری میرنشینی تەرابلوسدا نەما تەنیا سوور، عەسقەلان، غەزە و چەند قەلایەکی دوورەدەست نەبێت، سەرباری شاری قودسیش. لە سەرەتای ئەیلوولی ١١٨٧ز/ ١٦ی جومادای ئاخرەی ٥٨٣ک، سەلاحەدین لە بەیرووتەوە بەڕێ کەوت و هاتە بەردەم شوورەکانی عەسقەلان. ئەم شارەش لەڕووی ستراتیجییەوە بایەخێکی گەورەی هەبوو، چونکە دەکەوێتە سەرەڕێی نێوان میسر و شام. سەلاحەدین لەم هەڵمەتەدا دوو دیلی فەرەنگیی لەگەڵ خۆی برد، گی دی لوسینیان و جیراری پێش لەشکری داویە، داوای لە مەلیک کرد ئەگەر کارێکی وا بکات عەسقەلان خۆی بەدەستەوە بدات، ئازادی دەکات. ئەمجا هاتنە نێزیک شوورەی شار، مەلیک بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد، گوتی چیدی شەڕ مەکەن و جیراریش هەر وای کرد و داوای خۆبەدەستەوەدانی کرد، بەلام شەڕکەرانی شار گوێیان بە بانگی هەردوو دیلە گەورەکە نەدا، بەڵکو بە جوێن و قسەی ناشیرین وەلامیان دانەوە و بڕیاریان دا واز لە بەربەرەکانە نەهێنن[١٧٠]. پاش گەمارۆدانێکی دوو حەوتویی، سەنگەرەکانیان خۆیان پێ ڕانەگیرا و لە ١٤ی ئەیلوولی ١١٨٧ز، سەرەتای ڕەجەبی ٥٨٣ک، عەسقەلان خۆی بەدەستەوە دا، ئەگەرچی هەندێ شەڕکەری موسڵمانیش کوژران، لەوانە میر حوسامەدین ئیبراهیم کوڕی حسێنی میهرانی کە یەکێک بوو لە میرە کوردەکان. پاش ئەمە بڕیار درا مەلیک گی دی لوسینیان ئازاد بکرێت، هەروەها ڕێگە بە فەرەنگەکانیش درا شار بەجێ بهێڵن و بچنە ئیسکەندەرییە، هەتا لەوێوە بەرەو ئەورووپا ڕەوانە بکرێن، بەمەرجێک نابێ لە کەلوپەلی خۆیان بەولاوە هیچی تر لەگەڵ خۆیان هەڵبگرن. بەم جۆرە عەسقەلان پاش داگیرکردنێکی ٣٥ ساڵی کەوتەوە دەست هاونیشتمانان[١٧١].

دوابەدوای ئەمە سەلاحەدین ڕووی کردە گرتنی ناوچە نێزیکەکانی عەسقەلان وەکو: ڕەملە، داروم، غەزە، یوبنا، بەیت لەحم، بەیت جبریل، نەترون کە بەدەست تیپی داویەوە بوون[١٧٢].

١٧٠. ئیبن ئەسیر، ١١/٥٤٥. ابن واصل، ٢/ ٢٠٩.

١٧١. ابن شداد، النوادر، ل٨١. ابن خلکان، وفیات الاعیان، ٦/١٧٨.

١٧٢. ئیبن ئەسیر، سەرچاوەی پێشتر، ١١/٥٤٦.

## رزگارکردنی قودس

دوای ئەوەی سەلاحەدین بۆی نەکرا بە ڕێگەی ئاشتی و بێ خوێن ڕشتن، قودس بگرێت، سوێندی خوارد دەبێ بەزەبری شیر بیگرێت. سەربازان کشانەوە و شالاویان بۆ شار برد و لە ناوەڕاستی ڕەجەبی ٥٨٣ک/ ٣٠ی ئەیلوولی ١١٨٧ز، لای باکوری شار چادری لێ هەڵدا. بالیان ئەبلینی سەروەری پێشووی ڕەملە و (لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا بالیان کوڕی بیرزان) یەکێ لە دیلەکانی شەڕی حەتین توانیی کار لە سەلاحەدین بکات و ماوەی بدات بچێتە ناو شار ژن و منداڵەکانی دەربهێنێ و بیاننێرێتە سوور. سەلاحەدین ڕێی دا بە مەرجێک شەوێک زیاتر لە قودس نەمێنێتەوە و چەک هەڵنەگرێت. بالیان سوێندی خوارد کە چۆنی دەوێ وا دەکات. کە چووە ناو شاری قودس، چاوی بە پەتریارک هەرقل و کۆمەڵێ لە تایەفەی داویە و ئەسپیتاری کەوت کە خەریک بوون بەرگریی شار ڕێک بخەن، ئەوانیش کە چاویان پێی کەوت کردیانە هاوار و داوایان لێ کرد لە شار بمێنێتەوە و سەروەریی کاری بەرگری بکات، پێیان گوت ماوەی نادەن لە شار بچێتە دەرێ. ئەویش بەقسەیانی کرد و نامەیەکی بۆ سەلاحەدین نارد عوزرخوازیی تێدا پیشان دا و ئەو بارودۆخەی بۆ باس کرد کە ناچاری کردووە سوێندەکەی خۆی بخوات. لە ڕاستیشدا بێ سوێند و بێ پەیمانیی خاچپەرستان لەگەڵ موسڵمانان شتێکی باو بوو و دەگوترا: (لا يمين يلزم الصليبي تجاه المسلمين)[١٧٣].

لەگەڵ ئەوەشدا چونکە سەلاحەدین مەرد و دڵنەرم و جوامێر بوو، تەنانەت لەگەڵ دوژمنی خۆیشی - وەکو مێژوونووسێکی تازەی ئەوروپایی دەڵێ- هەر بەوە نەوەستا لە بالیان خۆش بێت، بگرە پاسەوانیشی نارد بۆ ئەوەی مەلیکە ماریای ژنی و منداڵەکانی و دەست و پێوەند و هەموو کەلوپەلەکانی بە سەلامەتی بگەیەننە شاری سوور[١٧٤].

١٧٣. رنسيمان، ٣/٤٩. د. عبدالقادر اليوسف، علاقات بين الشرق والغرب، ل١٤٤.

١٧٤. رنسيمان، ٢/٧٤٨.

بالیانیش بڕیاری دا سەرکردایەتیی شەڕکەران بکات و هەر کەسێک چەکی پێ هەڵبگیرایە چەکداری دەکرد و چیی لە توانادا بوو کردی بۆ ئەوەی شارەکە بەردەستی سەلاحەدین نەکەوێت.

پاش پێنج ڕۆژ، سەلاحەدین بڕیاری دا سوپاکەی خۆی لەلای باکورەوە بگوێزێتەوە، چونکە ڕوو لە تیشکی هەتاو بوون و لەم لایەشەوە سەنگەر و قایمەکاریی شار زۆر پتەو بوو. بۆیە لە ٢٦ی ئەیلوولی ١١٨٧ز سوپاکەی لەسەر چیای زەیتوون دامەزراند، (نەقاب: کونکەر) توانیان لە کن دەرگای (العمود) لە چەند جێیەکەوە شوورەی شار کون بکەن. پاشان کونێکی گەورەیان لە شوورەکە کرد کە توانرا بە ناویدا بچنە شار، بەڵام بەرگریکەران سنگی خۆیان کردە سەنگەر لە بەردەم هێزی هێرشبەردا، ئێجگار بەتین و تاو شەڕیان کرد. بەڵام کەمیی ژمارەیان وای کرد نەتوانن هەتا سەر بەرگەی هێرشی بەردەوامی موسڵمانان بگرن، ئیتر پشتیان شل بوو و پەتریارک بڕیاری شەڕ ڕاگرتنی دا، بالیانیش پشتگریی کرد چونکە زانییان تا سەر بەکوشتدانی خەڵک گەوجییە. بڕیار درا بالیان خۆی بچێتە سوپاکەی سەلاحەدین داوای ئاشتی بکات و مەرجەکانی دیاری بکات، بەڵام سەلاحەدین بیری خستەوە، کە بڕیارێکە و داویەتی، دەبێ بەدەمی شمشێر قودس بگرێت، بۆیە پێویستە بێ مەرج دەرگەکانی شاری بۆ بکەنەوە. هەروەها ئەو کوشتارگەیەی خستەوە بیری بالیان کە ساڵی ٤٩١ک/ ١٠٩٩ز، پێش ٨٨ ساڵ خاچپەرستەکان بۆ موسڵمانانیان دانا کاتێک کە شارەکەیان گرت. بالیان بە سەلاحەدینی ڕاگەیاند ئەگەر بێت و لەگەڵ خاچپەرستان ڕێک نەکەوێت ئەوان هەرچی بکەوێتە دەستیان خاپووری دەکەن، بەتایبەتی (قبة الصخرة) و(المسجد الاقصي) و شوێنە پیرۆزەکانی تر[١٧٥].

لەبەرئەوەی کە سەرکەوتن هەر بەدەست دەهات، سەرکردە کەمێ شلی کرد نەوەکو قودس تووشی زیان بێت و بۆ خۆبەدەستەوەدان چەند مەرجێکی دانا، لەوانە: دەبێ هەر خاچپەرستەک ١٠ دینار (بۆ پیاو) و پێنج دینار (بۆ ژن) و یەک دینار (بۆ منداڵ) بدات. بالیان پێی گوت: شار ٢٠ هەزار هەژاری وای تێدایە کە ناتوانن ئەم پارەیە بدەن. سەرکردە گوتی: با تێکڕا لە جیاتی هەموو هەژارەکان

---

١٧٥. ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/٢١٤.

سەت هەزار دینار بدرێت واتا یەکی پێنج دینار. دیسان بالیان وای پیشان دا کە ئەو پارەیە لەم ڕۆژەدا کۆ ناکرێتەوە، بۆیە بڕیاری دا بەرامبەر بە ۳۰ هەزار دینار ۷۰۰۰ کەس دیل بکرێت. موسڵمانان بەوە سەرسام بوون کە دیتیان پەتریارک هەرقل ۱۰ دیناری دا، کە لە شاریش دەرچوو بالای چەماوە بوو لە ژێر کۆڵی قورسی زێڕدا، جگە لەو ئارەوانەیلەی کەلپەل و ڕایەخ و دەفری گرانباییی ئەویان هەڵگرتبوو.. لە هەمان کاتدا ژمارەیەکی زۆری هەزارانی کریستیان لەبەر ئەوەی پارەی خۆکڕینەوەیان نەبوو دەبوونە دیل.

ڕۆژی هەینی ۲۷ی ڕەجەبی ۵۸۳ک/ ۲ی تشرینی دووەمی ۱۱۸۷ز، شەوی ئیسرا و میعراج، شاری پیرۆزی قودس بەبێ ڕژانی دڵۆپە خوێنێک خۆی بەدەستەوە دا، تەواو بەرەواژ و پێچەوانەی ئەوە پێش ۸۸ سالان ڕووی دا کاتێ خاچپەرستان قودسیان گرت و پێی ولاخەکانیان لە ناو خوێنی موسڵماناندا دەچەقی. سەرباری ئەمەش سەلاحەدین فەرمانی دا ماڵی کەس تالان نەکەن. پیاوەکانیشی بەناو شاردا دەگەڕان نەیاندەهێشت کەس دەست بۆ کریستیانە لاتینەکان (ئەوروپایی) درێژ بکات. هەروەها لەسەر داوای مەلیکی دادپەروەر، ئەبوبەکری برای، ۱۰۰۰ دیلی خاچپەرستی ئازاد کرد و هەر لە ڕێی خوا ۷۰۰ دیلی تریشی ئازاد کرد و بڕیاری دا پیرەمێرد و ئەو ژنانەی بێ خاوەن ماون، ئازاد بکرێن، پێشتریش ئەو ژنە دیلانە بەرەڵڵا کران کە جاران بەدیل گیرابوون و لە گەنجینەی خۆی پارەی بەسەر بێوەژن و هەتیواندا بڵاو کردەوە. ڕەنسیمان دەڵێ: بەڕاستی دڵ نەرمی و بەزەی سەلاحەدین تەواو پێچەوانەی کرداری داگیرکەرە خاچپەرستەکانی هەڵمەتی یەکەمی سەلیبی بوو. ئەو سەرکردەیە زۆر بەتوندی سزای ئەو کەسەی دەدا کە ئازاری دیلە کریستیانەکانی لای خۆی بدایە[176].

کریستیانە هاونیشتمانەکانیش (ئەرتۆدۆکس و یەعقوبیە نیشتەجێیەکان) هەروەکو پێش داگیرکردنەکەی خاچپەرستی لاتینی هەر لە قودس مانەوە، بەمەرجێک هەر کەسێک سەرانەی بڕیاردراو بدات و هەزارانیش لە سەرانەدان هاتنە بووردن. دەوڵەمەندەکانیشیان شمەک و خانووبەرەی کۆچکردووەکانیان کڕی. ئەم کریستیانە هاونیشتمانیانەش بەڵێنیان بە سەلاحەدین دابوو دەرگەی شاری بۆ

---

۱۷٦. رنسیمان، ۲/۷۵۳-۷٥٤.

بکەنەوە، بگرە حەزیان دەکرد کوشتارگە بۆ فەرەنگەکان دابندرێت[177].

کە هەواڵی سەرکەوتنی سەلاحەدین بەسەر خاچپەرستە لاتینییە ڕۆژئاواییەکان گەیشتە قوستەنتینییە، ئیمپراتۆری بێزەنتەیی ئیسحاق ئەنجیلوس دەستەیەک نوێنەری خۆی ناردە لای سەلاحەدین بۆ پیرۆزبایی، پێشنیازی ئەوەشی کرد دژی لاتینییەکان پەیمانێک ببەستن[178]. پاشان دروشمی شوێنە پیرۆزەکانی شار وەکو جارانیان لێ کرایەوە، (قبة الصخرة) و(المسجد الاقصی) لە جێ پەنجەی داگیرکەران پاک کرانەوە و گوڵاوڕشێن کران. ڕۆژی هەینی ٤ی شەعبان/ ٩ی تشرینی دووەمی ١١٨٧ز، سەلاحەدین و کۆمەڵێ لە نوێژکەران نوێژی هەینی و نوێژی سوپاسبژێریان لە (المسجد الاقصي) کرد و (قازی قوزات)ی حەلەب محیدین محەمەد کوڕی عەلی کوڕی محەمەد (ناسراو بە ئیبن زەکیەدینی دیمەشقی) بەم بۆنەیەوە وتارێکی خوێندەوە[179].

سەلاحەدین بە وەرگرتنەوەی قودس گرینگترین ئەرکی ئاینیی خۆی بەدی هێنا و هەواڵی مزگێنیی بۆ خەلیفەی عەباسی (الناصر لدين الله) و هەموو لایەکانی دنیای ئیسلامی نووسرا و نووسەری بەناوبانگ عیمادەدین ئەسفەهانی بینینەکانی خۆی لەم ڕووەوە لە کتێبی (الفتح القسي في الفتح القدسي)دا کۆ کردووەتەوە. شاعیرێک نەما لە خاکی عەرەب و دنیای ئیسلام بەم بۆنەیەوە هەڵبەست نەنووسێت[180]. پەخشاننووس و ڕەوانبێژانیش بەهرەی خۆیان تاقی کردەوە، وەکو نووسەری گەورە و ڕاوێژکاری سەلاحەدین قازی فازیل عەبدولڕەحیم بیسانی[181]. پاشان سەلاحەدین ویستی هەردوو شاری کەرک و شۆبەک ئاشتییانە بگرێت، بەڵام هەوڵەکەی سەری نەگرت، بۆیە مەلیکی عادل ئەبوبەکر هەڵمەتێکی لە میسرەوە بردە سەر کەرک و ماوەی ساڵێک پتر گەمارۆی دا، خاچپەرستەکان کۆڵیان نەدا و دەرگەی قەڵاکەی نەکرایەوە هەتا دوا ئەسپیان خوارد، کە مابوو، ئەمەش لە کۆتای

١٧٧. هەمان سەرچاوە، ٢/٧٥٤.

١٧٨. د. اليوسف، سەرچاوەیەکی پێشتر، ل١٤٣.

١٧٩. ترجمة ابن زكي الدين الدمشقي، رقم ٥٦٦ لة ابن خلكان، وفيات الاعيان. ابن واصل، مفرج الكروب: ٢/٢١٩-٢٢١. الروضتين، ٢/١١٠-١١٢.

١٨٠. بۆ نموونە، بڕوانە کتێبی "الروضتين، ٢/١٠١-١٠٧".

١٨١. ابن خلكان، ١٨٦.

سـاڵی ١١٨٨ز دا بوو، بەرگـریـیـەکـەی شـۆبەکـیش چەند مـانگێک دەوامـی کـرد. هاوشـێوەی ئەم دوو شـارەش، قـەڵای سـەفـەد لە باکور، کە بەدەسـت تیپی داویەوە بوو، بەرگـرییـەکی توند و بەتاوی کـرد و دوای یەک مـانگ بەردەبـارانی مـەنجـەنیق ئینجـا خۆی بەدەسـتـەوە دا. تیپی ئەسـپیتاریش چاوی لە تیپی داویە کرد و قـەڵای کەوکـەبی[182] بەدەسـتـەوە دا، کـە کـەوتووەتە سـەر گـردێک لەبان شـیـوی ڕووباری ئوردن[183]. بەڵام قـەڵای شـەقیف ئەرنون هەر بەدەست خـاچپـەرسـتـانـەوە مـا، کـە بەدەست ڕینالدەوە بوو، ئەم ڕینالدە پیاوێکی فێڵباز بوو، توانیی پەیمانێکی ئاشتی لەگەڵ سەلاحـەدیندا ببەسـتێ و وا پیشـان بدا حەز دەکـا قەڵاکەی بداتێ و لەوانەیە موسـڵمـانیش بێت. سـەلاحـەدین نەیزانی ئەم کـردارەیلە هەمـووی چاوبڕاوە و بۆ ئەوەن سەلاحـەدین لێ گەڕێت بەکەیفی خۆی سـەنگەر و قـوللەکانی قـایم و بەرگـریی پتـەو بکات. سـەلاحـەدین وازی لێ هـێنا و ڕووی کـردە باکـور، بەرەو مـیـرنشـیـنی تەرابلوس و ئەنتاکیە کەوتە ڕێ. ئەمە و هەندێ قەڵا بەربەرەکانییەکی زۆریان نواند وەکـو ئەنتـەرتووسی بەنـدەری شـامـی نێـوان ئـەنتـاکـیـە و حـەلەب و وڵاتی ڕۆم[184]. هەروەها شـاری مەرقـەب و (حصن الاکراد). بەڵام جبلە و لازقیـەی ئەوپەڕی وڵاتی شـامـی گـرت، پـاشـان ڕووی کـردە ناوەوەی وڵات و پاش بـەربەرەکـانێـیـەکی چەند ڕۆژی دەسـتی بەسـەر (سـەهیـۆن)دا گـرت[185]. پاش ئەمە بـە دوو حـەوتوو ئۆردووی قەڵای (بکاس الشغر) خۆی بەدەستەوە دا[186].

قـەڵای (بـەرزیە)ش پاش بەرگری، ئـەمـجـا دربسـاک لە چیـای ئەمـانـوس، سـەری دانەواند. دوای ئـەویش قـەڵای (بـەغـراس) کـە دەمـیڕوانـیـیـە ڕێی نێـوان ئەنتـاکـیـە و

---

١٨٢. قـەڵای کەوکـەب لەسـەر ئەو چیایەیە کە دەڕوانێتە شـاری تەبەریە، نێزیکی ڕووباری ئوردن. یاقوت، ٤/٤٩٤.

١٨٣. شـەقیف ئەرنون، قـەڵایەکی سـەختـە لە ئەشکەوتێکی چیای نێزیک بانیـاس، یاقـوت، ٤/٤٩٤.

١٨٤. یاقوت الحموی، ٣/٢٨.

١٨٥. سـەهیـۆن قـەڵایەکی قـایمـە لە دامـێنی چیـایەکی دیار کـەناراوەکـانی شـامـە، خەندەقەکانی بریتین لە دۆڵی قووڵ و گەورە، سەر بەناوچەی حیمسە، یاقوت، ٣/٤٣٧.

١٨٦. بکاس الشـغـر، بریتـیـیـە لە دوو قـەڵا لە ناوچەی حـەلەب، لەسـەر ڕووباری عـاسین. یاقوت، ١/٤٧٤.

قەلقیلیە. سەلاحەدین توانیی ئەو بنکانەی کەوتوونەتە لای ڕۆژاوای ئەنتاکیە هەموویان بگرێت. سەروەری ئەنتاکیە "بوهیمەند" تەنیا مەڵبەندی میرنشینەکەی بەدەستەوە مابوو، بۆیە لە سەلاحەدین پاڕایەوە تا پەیمانی ئاگربەستی لەگەڵدا ببەستێت، ئەمیش دان بنێ بەو سەرکەوتن و شار گرتنانەی سەلاحەدیندا، ئەویش وەلامی باشەی دایەوە و ماوەی ئاگربەستەکەی بە حەوت مانگ دانا کە لە ئایاردا کۆتای بێت[187].

١٨٧. ابن الاثیر، ١٩/١٢ دەڵێ ماوەکەی ٨ مانگ بوو. ابن العدیم، ٣/١٠٧.

## پێشەنگەکانی هەڵمەتی سێیەمی سەلیبی

دوابەدوای ڕزگارکردنی عەسقەلان و بەرەڵڵاکردنی گی دی لوسینیانی مەلیکی پێشووی قودس، لەسەر داخوازی و پاڕانەوەی سیبلانی ژنی، ئەم مەلیکە سوێندی خوارد کە جارێکی تر دژی سەلاحەدین چەک هەڵنەگرێت، بەڵام زۆری پێ نەچوو لە سوێند و پەیمان هەڵگەرایەوە، هەندێ سواری لە دەوری خۆی کۆ کردەوە و بەرەو سووړ کەوتە ڕێ، لە سووڕیش کۆنراد کە بووبوو بە حوکمڕانی شار دەرگەی لێ نەکردەوە و هەر لە دەرەوەی شوورەکانی شاردا مایەوە. پاشان ڕۆژان هەلێکی وای بۆ ڕێک خست ببێ بە سەرۆکی هێزێکی تازەی خاچپەرستان کەوا کەشتیگەلی سقلییە کە بۆ یاریدەی خاچپەرستان هات و هێزە سەربازێکی بیزاییی ئیتالیاش کە لە سووڕ بوون هاتنە لای، سوپایەکیان لێ پێک هات ٧٠٠ سوار و ٢٠٠ پیادە بوون، پاشان لە دانیمارکەوە ١٢ هەزار شەڕکەر و لە هەندێ شوێنی تریشەوە، بە هاواریەوە هاتن کە سەرجەمی شەڕکەرانی بوو بە ٢١ هەزار شەڕکەر، ئەم کۆمەڵبەستییەش بە پێشەنگی هەڵمەتی سێیەمی خاچپەرستانە دادەنرێت، لۆسینیان پێش کەوت و چوو دەوری شاری عەکای پێیان گرت.

سەلاحەدین هەستی بە مەترسی کرد، هەوڵی دا زوو سوپاکەی لۆسینیان تێک بشکێنێ، پەلاماری دان و توانیی زیانیان پێ بگەیەنێ، بەڵام بە سەرکەوتنێکی ناتەواو دانرا، چونکە سەرکردەیلی سوپای ئیسلام پاش ئەم سەرکەوتنە داوای پشوو و حەسانەوەیان کرد، ماوەی حەسانەوەکەش بە ١٥ ڕۆژ دیاری کرا، ئەمەش بوو بە هەڵەیەک کە لە ئەنجامی بایەخ نەدان بە کات و بە هێز و توانی دوژمن پەیدا بوو. ڕووداوەیلی دواتر ساخیان کردەوە کە حەسانەوەکەی ٦ی تشرینی دووەمی ١١٨٩ز، بووە هەوێنی زۆر دەردەسەری. گۆڕانی کژ و هەوای وەرزی زستانیش وای کرد ئەو پشووە تا وەرزی بەهار درێژە بکێشێت، کە لەو ماوەیەدا خاچپەرستەکان توانییان گەمارۆدانەکەی عەکا توند و پتەوتر بکەن[١٨٨]. دەمێکیش

١٨٨. د.الیوسف، سەرچاوەی پێشتر، ل١٤٤.

سەلاحەدین بۆ ڕزگارکردنی عەکا لە گەمارۆدان و لەناوبردنی هێزە شەڕکەرەکانی خاچپەرست، گورج بەخۆ کەوت، سەیری کرد ئەمانە لە جێی باش خۆیان قایم کردووە. بۆیە ناچار بوو پاش هێڵەکانی ئەوان، زۆر لەوان دوور نا، ئۆردۆ هەڵبدات، پاشان هیمداد بۆ هەردوو لا هات. کە هێزەیلی سەلاحەدین لە جێی خۆیان دامەزران، سەلاحەدین لە بەرەبەیانی ڕۆژی ٢ی شەعبانی ٥٨٥ک/ ١٥ی ئەیلوولی ١١٨٩ز، هێرشێکی کەم مەودای بردە سەریان و توانیی کەمێک لە شوێنی خۆیان هەڵیان کەنێ و خۆی بگەیەنێتە دەرگەی عەکا و هەندێ لە هێزەکانی خۆیان بباتە ژوور[١٨٩]. بەلام خاچپەرستەکان بەردەوام سەنگەر و شوێنەکانی خۆیان قایم دەکرد و سوپاکەیان بەهێزتر کرد، بەتایبەتی کە لە کەرتی باکوری ڕۆژهەلات، لە سوپاگەوە تا زەریا، قایمکارییەکی ئەوتۆیان کرد بووە هۆی توندکردنی گەمارۆدانەکەتی عەکا و جگە لە تیپی ئەسپیتاری بەناوبانگترین سەرکردەکانیان پارێزگارییان لێ دەکرد، بەم شێوەیە ڕێی موسڵمانایان بەرەو شار بڕی[١٩٠].
زستان هات و مانگی ڕەمەزانی لەگەڵدا هات و دۆخەکە ساردی و ماتیی بەسەردا کشا. میرەیلی سوپای سەلاحەدینیش داوایان کرد بگەڕێنەوە ولاتی خۆیان و لەناو ماڵ و منداڵیاندا مانگی ڕەمەزان بەسەر ببەن، بەتایبەتی وا شەڕ لە وەرزی زستاندا وەستاوە. ئەویش ڕێی پێیان دا برۆن. بەلام خۆی بڕیاری دا لەگەڵ سەربازانی تایبەتی خۆی هەر بمێننەوە و چووە سەر گردی (الخروبة)، لەو دەمەشدا بۆگەنیی لاشەی کەڵەکە بووی مردووان هەوای ناخۆش کرد و دەرد و پەتا تەشەنەی کرد. تەنانەت ژمارەیەک لە میر و شەڕکەران بە نەخۆشی مردن، سەلاحەدین خۆشی نەخۆش کەوت و لەسەر پرس و ڕای پزیشکەیل ئەوێی بەجێ هێشت و کشایەوە گردەکەی (الخروبة)[١٩١].

سەرکردەی بەرز لەجیاتی ئەوەی پشووێکی حەسانەوە بدات لە شارێک لە شارەیلی وەکو حەلەب و دیمەشق و قودس و بەیرووت یان قاهیرەدا نەختێک ڕابوێرێت، یان تامی ئەو گەورەیی و شان و شکۆیە بچێژێت کە بە درێژاییی سالانی پێشوو وەدەستی هێنا، سەنگەرگرتنی لە دوژمن پێ باشتر بوو، لە گردی

١٨٩. ابن شداد، النوادر، ١٠٦.

١٩٠. د.السيد الباز العريني "الشرق الأوسط والحروب الصليبية"، ١/٩٠٤.

١٩١. سيد امير علي "مختصر تاريخ العرب"، خانەی العلم للملايين، بەيرووت ١٩٦٧.

خەرووبەی ناو چوڵستانێکی وشکدا مایەوە و بیری دەکردەوە و ڕا دەما و چاوی بە بارەکەدا دەگێڕا، خەم و نەخۆشی و زریانی بەفری زستان شاڵاویان بۆ هێنا، مانگی ڕەمەزان و هەردوو جەژنی لەو شوێنە لاچەپەدا بەسەر برد. بە ورەیەکی بەرز و خواستێکی نەلەرزیو بەرەنگاری زستان بوو و چاوەڕوانی دەکرد. ژیانیش لە سوپاگەی خاچپەرستان لەو زستانەدا زۆر سەخت بوو، ئازووخە لە تەواوبووندا بوو، نرخی شتومەک هەستا، نرخی گەنم چەند جار لە نرخی جاران زیادی کرد، هێلکەیەک بە یەک درهەمی زیو بوو، بازرگانە چڵێسەکانیش هەلی خۆیان وەدەست هێنا بۆ دروونەوەی قازانجی لەرادەبەدەر. گەلێ سەرباز لە برسا مردن و گۆشتی ئەسپەیلی خۆیان دەخوارد و ڕیخۆڵە و ورگی وڵاخە تۆپیوەکانیش چنگ نەدەکەوت، گیایان دەخوارد و لە بەردەم نانەواخانەکاندا شەڕ دەقەوما[192].

لەتاو برسیەتی، زۆر کەس لە سوپاگەی دوژمنەوە ڕایان دەکردە ناو سوپاگەی موسڵمان و داوای ئەمانیان دەکرد، کە تێر دەبوون نەدەگەڕانەوە، هەندێکیشیان موسڵمان دەبوون، هەندێکیشیان لە کار دادەمەزران و هەندێکیشیان دەگەڕانەوە لای هاوڕێیانیان[193].

ئاوی خواردنەوە بوو بە گرفتێکی قورس، نەخۆشی لە ناو شەڕکەرەیلیاندا بڵاو بووەوە و هەرا کەوتە نێوان سەربازانی گی دی لۆسینیان و کۆنراد مونتەگراتی سەروەری سوور. پاشان هەردووکیان لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە شاری سەیدا و سوور، دوای داگیرکردنیان بدرێنە میرنشینی سوور، کۆنرادیش دان بە لۆسینیاندا بنێ کە مەلیکی قودسە. ئەو ساتە کۆنراد لە سوورەوە ئازووخە و چەک و دار و تەختەی هێنا بۆ دروستکردنی قوڵەی گەمارۆدان و توانییان ژمارەیەک قوڵەی زۆر گەورە لە تەنیشت شوورەیلی شار و لە هەر سێ لایەوە دابەستن کە بە حەوت مانگ تەواویان کرد[194].

موسڵمانان زۆر لەو قوڵلانە ترسان، بەڵام لاوێکی دیمەشقی بەناوی عەلی کوڕی سەرۆکی مسگەران توانیی ئاگر لەو قوڵە پێنج نهۆمییانە بەربدات. کە هەموو

١٩٢. هارۆڵد لامب، سەرچاوەیەکی پێشوو، ل١٩٥.

١٩٣. الروضتين، ٢/١٦٥.

١٩٤. ابن الأثير، ١٢/ ٤٥، ابن واصل، ٢/٣١٥.

قـولله‌كـان سـووتـان، مـوسـڵـمـانـان كـردیانه ئاهه‌نگێک هـاوتای نـه‌بێت. لاوه‌كـه‌ش پاداشـتی وه‌رنـه‌گـرت و گـوتـی ئه‌م كـاره‌ی له ڕێی خـوادا كـردووه[195]. له‌مـانگی ڕه‌بیعول ئه‌وه‌لی ٥٨٥ك/ نیسـانی ١١٩٠ز، به‌هار هـات و سه‌لاحـه‌دین له هه‌ر لایه‌ک له لایه‌كانی ده‌وڵه‌ته به‌رفره‌وانه‌كه‌یه‌وه هێزی بۆ هات، پاشـان گه‌ڕایه‌وه شوێنه‌كه‌ی جـارانی لـه ده‌شـتـی عـه‌كـا، بۆ ڕزگـاركـردنی شـاره‌كـه و ڕێ نه‌دان بـه دووباره داگیركردنه‌وه‌ی له‌لایه‌ن خاچپه‌رستانه‌وه. به‌ڵام ئه‌م ته‌قه‌لایه سـه‌ری نه‌گرت، چونكه دوژمن له وه‌رزی زسـتـاندا ژمـاره‌یه‌كی زۆر ئامـێری وێرانـكردنی ڕێک خـسـتـبـوو، ده‌بابه و قولله و په‌یژه‌ی ئێجگار بڵندی ئاماده كردبوو كه موسڵمانانی ناو شاریان به‌ردمباران و ئاگرباران ده‌كرد و به‌سـه‌ر دیواری شووره‌كان ده‌كه‌وتن. سه‌لاحـه‌دین وای ده‌زانی كـه ده‌توانێ بـه شـه‌ڕی لاوه‌كی خـه‌ریكیـان بكات، به‌ڵام ئـه‌وان ئه‌وه‌نده به‌هێـز بووبوون كـه به یه‌ک جار، لـه لایه‌كه‌وه ڕووبه‌ڕووی هـێزه‌كـانی سـه‌لاحـه‌دین ده‌بوون و له‌لایه‌كی تریشه‌وه به‌رده‌وام په‌لاماری عه‌كایان ده‌دا.

هه‌ردوو لا له وشكانی و زه‌ریادا چه‌ند مـانگێكی زۆر شه‌ڕ و كوشتاریان كرد، له گه‌مـارۆدانێكدا كه به‌ناوداترین ڕووداوه‌كانی مێژووی شه‌ڕ و هه‌راكانی چه‌رخی ناوه‌ڕاست داده‌نرێت، هه‌ردوو لا زیانی گـه‌وره‌یـان لێ كـه‌وت و هـه‌ردوو لا تا بڵـێی ئازایه‌تی و قـاره‌مـانه‌تییـان پیشـان دا، به‌رده‌وامیش هیمداد له شـاره‌كانی شـام و مـیسـر و جـزیره‌وه ده‌گـه‌یشـتـه ده‌شـتـی عـه‌كـا و یارمـه‌تیش له به‌یرووت و له ئیسكه‌نده‌رییه‌وه سـه‌ره‌ڕای ئاسـتـه‌نگێكی زۆر، به‌خـه‌ڵكی ناو شـاری گـه‌مارۆدراو ده‌گه‌یشت. به‌ڵام ئه‌و هیمدادانه‌ی له ئه‌وروپاوه ده‌گه‌یشتنه خـاچپـه‌رستـان ئه‌وه‌نده زۆر بوون هـێزه‌یلـی ئیسـلام نه‌یانده‌توانی ڕێیـان لێ بگرن، زه‌ریا پشت و پـه‌نای خاچپه‌رسته‌یل بوو، چ بۆ گه‌یاندنی یارمه‌تیی پیاوان یان كه‌لپه‌ل و خۆراک[196].

هه‌رچی له‌باره‌ی سازكاریی ئه‌وروپایه بۆ هه‌ڵمه‌تی سێیه‌می خاچپه‌رستان، ئه‌وا پیـاوه ئاینییـه‌كـان به ڕه‌به‌ن و قـه‌شـه‌وه دوابه‌دوای ڕزگـاركـردنـی قـودس له‌لایه‌ن موسـڵـمـانانه‌وه ده‌سـتـیـان دایه هـاندانی خـه‌ڵک، به‌رگی ڕه‌شـیـان له‌به‌ر كـرد و به سه‌رۆكایه‌تیی پـه‌تریاركی قودس به‌شاره‌كاندا ده‌گه‌ڕان، خه‌می خۆیان ده‌رده‌بڕی بۆ

---

١٩٥. ابن الأثیر، ١٢/٤٧. المقریزی، السلوک، ١/١٠٣.

١٩٦. فـیلیپ حـه‌تی، تـاریخ سـوریه ولبـنان وفلسـگین، خـانه‌ی پقـافـه و ده‌زگـای فـرانكلین، به‌یرووت ١٩٥٩، به‌رگی٢، ل٢٣٩.

لەدەسـتـچـوونی قـودس و داوای تۆڵە وەرگـرتنیـان لە مـوسـڵـمـانان دەکـرد، وێنەی حـەزرەتی عـیسـایان وا نـەخـشـاندبوو کـە مـوسـڵـمـانێک دەیکوتا و خـوێنیـان بە وێنەکەیدا پرژاندبوو. بەم کارە فـەرەنگەکان کەڵلەیان گەرم بوو، هەتا ژنانیشـیـان هاتن، کۆبوونەوە و خۆیان بۆ هێرش ساز کرد[١٩٧]. مـەلیکە گەورەکانی ئەورووپاش لەگەڵ هەڵمـەتەکەدا هاتن بەپێچەوانەی هەڵمەتەکانی پێشـوو و دواتر: وەکو هنریی دووەمی مـەلیکی ئینگلتـەرە (١١٥٤-١١٨٩ز) و فلیپ ئۆگەستـسی مـەلیکی فرەنسـا (١١٨٠-١٢٢٣ز) و ئیـمـپـراتۆری دەوڵەتـی پیـرۆزی ڕۆمـانـی (ئەڵمـانیـا) مـەلیـک فریدریک بەربەرۆسـا (١١٥٢-١١٩٠ز) هەروەها ولیەمی مـەلیکی سقلیـەش کە پێش هەمـووان و پێش هەڵمـەتە ئەورووپاییـیـەکە یارمـەتیی سوپاییی نارد و لـە بەرگریی شـاری سـووردا بەشداریـی کرد، بەڵام مـردنی لەو کاتەدا بـووە هۆی دووبەرەکی و بەربەرەکـانێ لەسـەر عـەرشی سـقلیـە، کـە لـە ئەنجـامـدا بووە هۆی کـشـانەوەی هێزەکانی نۆرماندیی سقلیەیی لە مەیدان و گەڕانەوەیان بۆ وڵاتەکانیان.

وا چاکـە سـەرنجێک بدەینە مـەترسـیی ئەو هەڵمـەتەی، کـە گـرینگییـەکـەی لە بەشداربوونی ئەو مـەلیکانەدا دیارە، کە لەسەر خواستی پاپا هاتن، لەوانە مـەلیک هنریی دووەم و ڕیچـارد (شـێـردڵ)ی کـوڕی. ئـەم مـەلیکە بـە سـەر و بە مـاڵ بۆ هەڵمەتەکە خۆی ئامادە کرد، ئەوە بوو باجێکی نوێی لەسەر گەل دانا بەناوی باجی سـەلاحـەدین Saladin Tax بەڕادەی دەیـەک لە هەمـوو بەروبوومی و دەسـتکەوتێک وەردەگیـرا، بەڵام زوو مرد و ڕیچـاردی کـوڕی (١١٨٩-١١٩٩ز) کە یەکێک بوو لە سوارچاکە ئازاکانی ئەورووپا، بۆیە نازناوی "شێردڵ"ی پێ درابوو. سـەرکردایەتیی هەڵمـەتی ئینگلیزی گرتە دەست. ڕیچارد لە کەناڵی ئینگلیزی پەڕییـەوە ئەوبەری فرەنسا و لەگەڵ فلیپ ئۆگەستسی مەلیکی کۆبوونەوە، ڕێک کەوتن کە دەستکەوتی ڕۆژهەڵات "خاکی فـەلەستین" دوای داگیرکردنی بە یەکسانی بە نیوە بکەن. مەلیکی ئینگلتـەرە بەرەو مـەرسـیلیە دەسـتی بە گەشت کرد، بەڵام لەوێوە بای دایەوە سـەر پورتوگال بۆ بەگژداچوونی موسڵمانان لەسەر داخوازیی مەلیکەکەی، بۆیە دروستە بڵێین ئەوەی لە خـاکی شام ڕووی دا تەواوکردنی کـرداری ئیسپان و پورتوگالەکانە لە دەرکـردنی مـوسـڵـمـانان لە نیـوە دوورگـەی ئیـبـەریا، لەو هەڵمـەتەی کـە بە

١٩٧. ابن الأثیـر، ١٢/٣٢. ابن شـداد، ١٣٦-١٣٧. ابو شـامـە، الروضـتین، ٢/١٦٠. ابن واصل، ٢/٢٨٨.

"جووڵانەوەی وەرگرتنەوە" ناونرا. پاشان بە ڕێی ئیتالیادا بەرەو ڕۆژهەڵات کەوتە ڕێ، گەیشتە جەنەوە، پاشان سقلیە کە هەردوو ئاڵای ئینگلیزی و فرەنسای لەسەر هەڵدرا هەروەکوو هەردوو مەلیک پەیمانیان دابوو. لە ڕێگەدا ڕیچارد دوورگەی قوبرسی داگیر کرد، بەم کارەی ئیمپراتۆی بیزەنتاییی تووڕە کرد و بە دەرچوون لە مەسەلەی پیرۆزی خاچی دانا. مەلیکی فرەنساش فلیپ ئوگەستس بەخۆی و سوپای فرەنسا، بە خاکی ئیتالیادا ڕەت بوو، پاشان چووە قوبرس لەگەڵ مەلیکی ئینگلتەرە زستانیان لەوێ بەسەر برد، پاشان بەرەو فەلەستین کەوتە ڕێ و لە ٣٠ی ئاداری ١١٩١دا لە عەکا دابەزین[١٩٨].

لەوانەیە گەورەترین و بەرزترین کۆمەڵی خاچپەرستان تیپی ئەڵمانی بووبێت، چونکە پێشتر نەبووە هیچ دەوڵەتێک بەتەنیا ئەوەندە سوپایەی لەگەڵ هەڵمەتی خاچپەرستاندا ناردبێت. نەک هەر پێشتر، بگرە دوای سەت ساڵیش لەم مێژووە. سەرکردەشیان مەلیک فریدریکی یەکەم بوو، بەڵام لەبەر بەدکاری و کرداری ناشیرینی سەربازەیلی ئەڵمان، مەلیک لەگەڵ ئیسحاقی دووەمی ئیمپراتۆری بێزەنتا تووشی ململانێ و کێشە بوو، بەتایبەتی کە فریدریک لەگەڵ دوژمنانی ئیمپراتۆریەت (واتا نۆرماندی و سرب و بولگارەیل) پەیمانی بەستبوو، دوای ئەمەش ئەڵمانەیل ئەندریانو بلیان داگیر کرد، دواجار لە بۆسفۆر پەڕینەوە و بەرەو ئاسیای بچووک چوون، پاش ماوەیەک مەلیک لە ڕووبارێکی سارددا خنکا.

مردنی مەلیک کارێکی باشی کردە سەر بەرزبوونەوەی ورەی موسڵمانان، کارەساتێکی جەرگبڕ بوو بۆ سوپای ئەڵمان و خاچپەرستان، ئەگەرچی فریدریکی دۆقی سواپیای کوڕی جێی گرتەوە بەڵام وەکو باوکی شارەزا و بەدەسەڵات نەبوو، بەتایبەتی لە سەرکردایەتیکردنی لەشکرێکی وا گەورەدا، دۆقی سواپیا دەشتی خلیقیەی بڕی و لاشەی باوکیشی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو کە لەناو سرکەدا دای نابوو[١٩٩]. ژمارەیەکی زۆر لەو هێزە ئەڵمانییە لە ڕێ و بانی سەختدا پەرت و بڵاو بوون و بە دەرد و پەتاش ژمارەیەکی زۆریان لێ مرد، لە کۆی ٢٠ هەزار شەڕکەر تەنیا ٢٠٠٠ سەربازی ئازاربار گەیشتنە خاکی فەلەستین. سەلاحەدین و

١٩٨. ابن شداد، ل١٢٣.

١٩٩. رنسیمان، ٢/٤٢.

شەڕکەران و هەموو موسڵمانان خنکانی مەلیکی ئەڵمان و شڕبوونی سوپاکەیان بە کرانەوەی دەرگای ڕەحمەتی خوا زانی. بەم جۆرە خاچپەرستان کە بە گەرمی چاوەڕوانی گەیشتنی سوپای ئەڵمان و ڕزگارکردنی قودس بوون هیوایان تێک شکا. نامە و نامەبەریش لە نێوان ئیمپراتۆر ئیسحاقی دووەم و سەلاحەدین، لەبارەی ڕێرەوی سوپای ئەڵمان و بەسەرهاتیان لە هاتووچۆدا بوون[200].

بۆ هەردوو لا هێز دەگەیشتە عەکا، سوپای سەلاحەدین ئەوەندە گەورە بووبوو کە بەشی ئەوەی دەکرد دەوری خاچپەرستان بگرێت کە لەلای وشکانییەوە گەمارۆی عەکایان دابوو، لە زەریاشەوە ٥٠ پاپۆری ئیسلام بەنێوان کەشتیگەلی خاچپەرستاندا ڕەت ببێت و لە دوادوای تشرینی دووەمی ١١٨٩دا ئازووخە و خۆراک بگەیەنێتە عەکا، ئەگەرچی هەندێ زیانیشیان لێ کەوت، هەر لە کۆتای ئەو ساڵەشدا کەشتیگەلێکی گەورەی میسر توانیی پێوەندی بە بەندەرەوە دووبارە بکاتەوە.

---

٢٠٠. ابن شداد، لاپەڕەکانی١٢٤-١٢٥ و١٢٧ و, ١٣٢

## هێوربوونەوەی هەڵوێست

بە درێژای زستـان سـوپای ئیـسلام و خـاچپەرست ڕووبەڕوو وەسـتابوون، هیچ یەکێکیـان خۆی تووشی کوشتارێکی گرینگ و گەورە نەدەکرد، بەڵام هەندێ وردە شـەڕ و ڕووبەڕووبوونەوەی کـەمـخـایەن لە نێـوانیـاندا ڕووی دەدا، بەهۆی دووروودرێژیی ماوەی ڕووبەڕوو وەستان، جۆرە ئاشنایەتییەک لە نێوان هەردوو لادا پەیدا بوو، سوارەکانی هەردوو لا یەکتریان دەناسی و ڕێزی یەکتریان دەگرت، ئەگەر هەرایەکیش هەڵبگیرسایە، کە سەرکردەکان سڵاو و یەک دوو قسەیان لەگەڵ یەک بکردایە هەراکە دەبڕایەوە، هەندێ جاریش سەربازەیلی دوژمن یەکتریان بانگ دەکرد بۆ بینینی ئاهەنگ لە سوپاگەی یەکتریدا. جارێکیان کۆمەڵە منداڵێکی سوپاگەی ئیسلام هاتنە مەیدان بۆ پەنجەبازی لەگەڵ منداڵانی کریستیان هەر بۆ گاڵتە و گەپ و ڕابواردن[٢٠١].

هەر کە بەهار هات، هەردوو لا چاوەڕوانی هاتنی یارمەتیی پێویستی دەکرد تا بتـوانێت هێـرش دەست پێ بکات، بەڵام تەواوبوونی ئازووخـە لە سـوپاگـەی خاچپەرستان زۆر پەرێشانی کردن، بەڵام لەو کاتەدا کە خۆراک نەما و قاتی کەوتە ناویان، کەشتییەکی پڕ لە گەنم لە کەناراودا لەنگەری گرت، هەر کەشوهەوا خۆش بوو چەند کەشتییەکی تریش گەیشت و دەرگەی ژیان و خۆشییان لێ کرایەوە، نەک تەنیا لەبەر ئەوەی کـە خـۆراکیـان بۆ هێنابوون، بگرە لەبەرئەوەشی کـە هەواڵی نێزیکبوونەوەی مەلیکی ئینگلتەرە و مەلیکی فرەنساشی لە کەناراوەکانی فەلەستین هێنابوو[٢٠٢].

---

٢٠١. هـ.س.، لاپەڕەکانی١٠٨-١٠٩.

٢٠٢. رنسیمان، ٣/٧١.

## ریچارد شێردڵ

گەشتیگەلی ئینگلیزی لە ٥ی حوزەیرانی ١١٩١دا لە قوبرسەوە بەرەو کەناراوی شام بەڕێ کەوت و، مەلیک ئیسحاقی مەلیکی قوبرسی بەدیل گیراوی لەگەڵدا بوو. یەکەم شوێن کە ریچارد چاوی پێی کەوت قەڵای مەرقەب بوو لە باکوری کەناراودا، بەڵام بەرەو باشوور شۆڕ بووەوە بە ئەنتەرنووس و جبێل و بەیرووتدا تێ پەڕی، پاشان بڕیاری دا لە نێزیک سوور دابەزێت، چونکە پاسەوانانی شار لەسەر فەرمانی مەلیک ئۆگەستس و کۆنرادی حوکمڕانی شار نەیانهێشت بێتە ناو شارەکە، پاشان هەر بە ڕێگەی زەریادا ڕۆیشت تا گەیشتە عەکا، کەشتیگەلە گەورەکەی کە ٢٥ پاپۆڕی تێدا بوو لەنگەری گرت و دەروونی خاچپەرستانی گەمارۆدەری عەکای بەجارێ گەشاندەوە، بڕوا و هیوا لە دڵیاندا پتەو بوو، بۆیە کردیانە شایی و ئاهەنگ و فیشەکە شێتەیان هەڵدەدا و دەهۆڵیان دەکوتا. بە هاتنی مەلیکی ئینگلتەرە کە بوو بە سەرکردەی ڕاستەقینەی هەڵمەتی سێیەمی خاچپەرستی، گوڕ و گەرمییەکی تەواوی بە جووڵانەوەکە دا و هێزی خاچپەرستان پێویستیان بە یەکێکی وەکو ئەم پیاوە هەبوو، چونکە مەلیکی فڕەنسا لەبەر بەرچاوتەنگی و سڵەمینەوەی، نەدەبوو ببێ بەو سەرکردەیە، سەرۆکە ناوەخۆییەکانیش نەیاندەتوانی باوەڕی کۆمەڵانی خاچپەرست بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن. هەرچی ڕیچاردە خوێنێکی پڕ لە هێزی تەکان و دڕی تازەی بە هەڵمەتەکە دا.

خاچپەرستان زۆر ئامێری گەورەی بەتوانای شوورە هەڵتەکاندنیان دروست کرد، لەوانە بەردەقانێی مەزن کە بەردی فڕێ دەدا، هەروەها پەیژەیەکی گەورەشیان دروست کرد بۆ پێدا هەڵگەڕان، ناویان نا "کتک" و، بەهۆی ئەو بەردەقانێیانەوە هەندێ سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. هەردوو تیپ چیان لەدەست هات لە هونەر و هەوڵ و تفاق و ئامێری گەمارۆدانی وشکانی و زەریایی بەکاریان هێنا. کە هەموو سەردەمەیلی شەڕی خاچپەرستی وەکو ئەم جارەیان بەخۆوە

نەدیبوو. ئەمە لەلایەک، لەلایەکی ترەوە ڕیچارد یەکێکی ناردە ناو سوپاگەی سەلاحەدین و بانگی کرد بۆ دیدەنیی یەکتر.

مەلیکە ئینگلیزەکە تامەزرۆی ئەم جۆرە کۆبوونەوەیە بوو و ئاواتی بوو ئاشتییانە گرفتەکەی لەگەڵ ببڕێتەوە. بەلام سەلاحەدین بە پارێزەوە بە نوێنەرەکەی گوت: کارێکی ژیرانە نییە دوو مەلیکی دوژمن ئەگەر ئاگربەست یان پەیمانێکیان لە نێوانیاندا نەبێت کۆ ببنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا سازیی خۆی پێشان دا، کە ڕێ دەدا بە مەلیکی عادل، ئەبوبەکری برای، لەگەڵ دابنیشێ ئەمجا بڕیار درا تا سێ ڕۆژ شەڕ بوەستێ، ڕێک کەوتن کە کۆبوونەوەکە لە دەشتی نێوان هەردوو سوپاگەی ئیسلام و خاچپەرستدا بێ، کە بە گوێرەی زاراوەی تازەی سەربازی پێی دەڵێن زەویی قەدەغەکراو (ارض الحرام).

پاشان دەرد و نەخۆشی بەناو خاچپەرستاندا بڵاو بووەوە و مەلیکی ئینگلتەرە و مەلیکی فرەنسا نەخۆش کەوتن، بەتایبەتی ڕیچارد کە نەخۆشییەکەی گران بوو، داوای میوە و بەفری لە سەلاحەدین کرد، ئەمیش بۆی دەنارد. هەتا چاک بووەوە و لەناو پێخەفەوە سەرپەرشتیی کردارەیلی شەڕی دەکرد.. فەرمانی دا قوللەیەکی گەورەی دار دروست بکەن. ئینجا کە لە نەخۆشییەکەی هەستاوە چووە پشکنینی هێڵەیلی سەربازی[٢٠٣].

بەرەی موسڵمانانیش هیمدادی تازەی بۆ هات، بە هاتنی هاوین (حوزەیرانی ١١٩١) سوپای سنجار گەیشت، پاشان هێزێکی تازەی میسر، ئەمجا سەربازەیلی حوکمڕانی موسڵ و هێزی هەرێمەیلی تریش، بەلام هەموو ئەم هیمدادەیلە نەیانتوانی کارێکی سەربازیی یەکلاکەرەوە بە ئەنجام بگەیەنن، چونکە خاچپەرستان بە سەنگەری پتەو دیواری گڵ و شوورە و خەندەق خۆیان قایم کردبوو و بەردەقانییەکانیش شوورەکانی عەکایان بەردەباران دەکرد، تاکو توانییان کونێک لە شوورەکەدا بکەن و خاچپەرستان هەڵیان کوتایە سەر ئەو کەلێنە تا لێیەوە بچنە ژوورەوە، ئۆردوی ناو عەکا بە هێما، هەواڵی ئەمەی بە سەلاحەدین ڕاگەیاند، ئەوسا موسڵمانان هێرشیان بردە سەر سوپاگەی خاچپەرستان و تا ماوەیەک خاچپەرستانیان لە شوورەکان دوورخستەوە.

---

٢٠٣. رنسیمان، ٣/٩٨.

لە زەریاشدا جاربەجارێک شەڕ دەقەوما، بەڵام هاتنی کەشتیگەلی ئینگلیز و فرەنسا جڵەوی شەڕی زەریایان لە موسڵمانان سەندەوە و زۆر کەم ڕێک دەکەوت پارچەی کەشتیگەلی ئیسلام لەو ڕۆژانەدا بگەنە عەکا و ئازووخە بۆ شەڕکەرانی ناو شار ببەن. لەبەر ئەوە خۆراک و چەک و کەلپەلی شەڕ هاتنە بڕان و لەناو شار قسە بڵاو بووەوە کە شار خۆی بەدەستەوە دەدات، بەتایبەتی دوای ئەوەی تەقیەدین عومەری برازای سەلاحەدین نەیتوانی دڕ بە خاچپەرستان بدات و تا عەکا ڕێ پاک بکاتەوە. لە کاتێکدا لە ٣ی تەمووزی ١١٩١دا فرەنسییەکان توانییان کەلەبەرێکی گەورە لە شوورەکەدا بکەنەوە، بەڵام ناچار کران بکشێنەوە دواوە. پاشان خەڵکی شار و سوپاکەی تووشی سەغڵەتی و پەرێشانی بوون و هێزیان لەبەر بڕا و شوورەکان ڕووخان و ئارامی و توانی بەرگرییان نەما و زۆربەی پارچەکانی کەشتیگەلی ئیسلامیش، کە نائومێدانە هەوڵی قارەمانانەیان دەدا بۆ ڕزگارکردنی شار، تێکشکان. دوژمن هەندێکیانی تێک شکاند و شەپۆلی زەریاش هەندێکی نغرۆ کرد.

لە کاتێکدا تا دەهات ژمارەی خاچپەرستان پەرەی دەسەند، دەسەڵاتی زەریاییان گەورەتر دەبوو. میرلەشکرانی موسڵمانان تووشی بێ هیوایی بوون، زۆر لەو میرانە لە مەیدان کشانەوە چونکە درێژیی ماوە و پێداویستیی گرانی مەیدان کاری کردە سەر حاڵیان، نەک ئازایەتییان و توانیان، نەک گوێڕایەڵیان. بەتایبەتی کە دەمێک بوو لە میرنشینەکانیان دوور بوون و هەواڵیان نەدەزانی، چونکە پۆستە هەر بۆ کاربازی شەڕ و بە کەمیش بەکار دەهات. کە میرێکیش دەگەڕایەوە میرنشینەکەی کاربازی ناوخۆ خەریکی دەکرد، هەروەکو لە میری ئازا تەقیەدین عومەر قەوما، کە مەیدانی بەجێ هێشت، بەمەرجێک زوو بگەڕێتەوە، بەڵام ڕووداوگەلی ناو میرنشینەکەی خەریکیان کرد و نەیتوانی بگەڕێتەوە و سەلاحەدین زۆر داخی لە دڵدا بوو بۆی و تەنانەت نەمانی برازاکەی بە یەکێک لە هۆیەکانی کەوتنی عەکا دانا.

سەیفەدین عەلی کوڕی ئەحمەد ئەلمەشتوبی هەکاری، نامەی بۆ مەلیکی فرەنسا نارد و داوای ئاشتیی کرد و پێی گوت: ئێمە کە ئەم شارەمان گرت ڕێمان دا هەموو کریستیانەکان بچنە دەرێ و چۆنی دەیانەوێ وا بکەن، ئازادمان کردن لەوەدا بۆ هەر کوێیەک دەچن با بچن، چەک و کەلپەل و شتومەکی خۆیان و

کەسوکاریان لەگەڵ خۆیان ببەن، وا ئەمرۆش ئێمە شارەکەتان دەدەینێ بە مەرجێک وەکو ئێمە لەگەڵ قەومی ئێوەمان کرد ئێوەش وەهامان لەگەڵدا بکەن[٢٠٤].

بەڵام داخوازییەکەیان ڕەت کردەوە. (هەکاری) خۆی گەیاندە ناو عەکا و هانی خەڵکی دا بۆ غەزا و گیان بەختکردن لە پێناوی خوادا[٢٠٥].

خاچپەرستان داوایان لە مۆڵگەی عەککا کرد ٢٠٠ هەزار دینار بدەن و ٢٥٠٠ دیلی خاچپەرستان بدەنەوە و خاچی سەڵبوتیش بدەنەوە[٢٠٦].

پێش ئەوەی هەردوو لا بگەنە ئەنجام، هێزە هێرشبەرەکانی خاچپەرست چوونە ناو شار، ئیتر بەڵا و نەگبەتی بەسەر خەڵکدا هات و خەمباری دای گرتن، ئەوەش بزانە هەموو چەکی کەناراو و قودس و دیمەشق و حەلەب و میسری تێدا بوو[٢٠٧]. ئەوەی نەگبەتییەکەی زیاتر کرد ئەوە بوو دوژمن هەرچی مەرجی ئاشتی هەیە پێشێلی کرد و "هەرچی لە عەکا بوو بەدیل بردیان کە چەند هەزارێک بوون". خاچپەرستان لە ١٧ی جومادای ئاخرەی ٥٨٧ک/ ١٢ی تەمووزی ١١٩١ز هاتنە ناو عەکا و وایان پێشان دا بۆیە هاتوون تا بەپێی مەرجی ڕێککەوتن پارە و دیلەکان و خاچەکە وەربگرن. سەلاحەدینیش بەڕاستی کەوتە کۆکردنەوەی پارە و ئەوەندەی نەمابوو پارەکە بداتە سەرۆکەیلی دوژمن، بەڵام هاوڕێیانی پێیان گوت با پەیمانێکیان لێ وەربگرین کە دیلە موسڵمانەکان بەرەڵڵا بکەن، ئەویش داوای لە تیپی داویە کرد ئەوان مەرجەکانی ڕێکەتنەکە بەجێ بهێنن "چونکە ئەوان دیندارن و وەفایان هەیە.!" بەڵام ئەمان ئەم ئەرکەیان نەگرتە سەر شان و گوتیان: "ئێمە سوێند ناخۆین و بەڵێن نادەین چونکە لەوە دەترسین لە ئێمەوە بێ پەیمانی ڕوو بدات"[٢٠٨]. ئەو دەمە سەلاحەدین دڵنیا بوو کە بێبەڵێن و ستەمکارن بۆیە داواکەیانی ڕەت کردەوە[٢٠٩].

---

٢٠٤. ابن شداد،١٦٨.

٢٠٥. ابن شداد، ,١٦٨ ابو شامە، الروضتين ٢/١٨.

٢٠٦. ابن الأثير، الكامل، ١٢/٦٨.

٢٠٧. ابن الفرات، تاريخ ابن الفرات، چاپخانەی حەداد، بەسرا ١٩٦٧، بەرگی ٤، ل١٤.

٢٠٨. الكامل ١٢/٦٨.

٢٠٩. العماد، الفتح، ل٥١٣. سبط ابن الجوزي، بەرگی ٨، بەشی ١، ل٤٠٧-٤٠٨.

ریچـاردی شـێـردڵ ئەمـەی بەس بوو بۆ ئەوەی کـارێک بکات کە ئەوپەڕی قین و نامەردی و ترسنۆکی بنوێنێت، کاتێ فەرمانی دا ئەو موسڵمانانەی لە عەکا هاتنە دەرەوە و ژمارەیان نێزیکی ٣٠٠٠ کەسی کلۆڵ و ئازاربار دەبوو بیانهێننە گردی (العیاضیه) لەوێ بە گوریس بەستیانیانەوە و خاچپەرستان یەکدەست پەلاماریان دان و لە کوشتارگەیەکی بێ وێنەی دڵ تۆقێنی وا دا کە پیاو موچڕکی بەگیاندا دێت هەمـوویان کـوشتن. ئەمەش لە ٢٧ی ڕەجەبی ٥٨٧ک/ ٢٠ی ئابی ١١٩١دا، واتە ٨٠٠ ساڵ پێش ئێستا، پیاوە خاچپەرستەکانی ڕیچارد ئەو کوشتارەیان کرد بێ ئەوەی دڵیان کەمێک بشڵەژێ. مێژوونووسێکی ڕۆژئاوایی دەڵێ: سەربازەیلی ڕیچارد ئەوەندە سەرگەرم و تامەزۆری ئەم کوشتارە بوون، زۆر بەدڵێکی خۆشەوە سوپاسی خوایان کرد کە ئە هەلەی بۆیان ڕەخساند[٢١٠].

موسڵمانەیلی نێزیکی بنکەکانی عەکا، کە بەچاوی خۆیان ئەم تاوانە گڵاوە نامەردانەیان دی، تەکانیان دا بچن دیلەکانیان ڕزگار بکەن. بەڵام نەیانتوانی بیانگەنێ. دوای ئەوەی خاچپەرستان بەهۆی بڵاوبوونەوەی لاشەی شێواو و گەنیو، ئەم مەیدانە خوێناوییەیان بەجێ هێشت موسڵمانان دەیانتوانی بچن کەسوکار و دۆستە شەهیدەکانیان بناسنەوە[٢١١].

ئەو کردارە نامرۆڤانەیەی ڕیچارد و هەڤاڵانی دژی دیلە موسڵمانەکان، گەلێ لە ڕەوشتی بەرز و مایەداری سەلاحەدینی سەرکردە دوور بوو، ئەو چۆن لەگەڵ دوژمنی داگیرکەر دەجووڵایەوە؟ چیی بە دیلەکانی ئەوان دەکرد، دوای سەرکەوتنی گەورەی حەتین؟ پاشان دوای ڕزگارکردنی قودس و شارەکانی تری فەلەستین و شام؟ ئەو کارەی ڕیچارد کردی کردارێکی شوورەیی پێچەوانەی ڕەفتاری سەلاحەدین بوو لەگەڵ دیلە لاتینەکان[٢١٢].

ئەو ڕەفتارە دڕندانەیەی ڕیچارد لەگەڵ دیلەکانی گردی عیاضیە نواندی، بووە هۆی هەڵایسانی غیرەت و تیژکردنی هیممەتی موسڵمانان، کە دەبێ لە جاران زیاتر هەست بەو مەترسییە بکەن کە خۆی لەوان و لە وڵاتەکەیان دانووساندووە،

---

٢١٠. رنسیمان، ٣/١٠٦.

٢١١. سەرچاوەی پێشوو، ٣/١٠٧.

٢١٢. د. فیلیپ حتی، صانعو التاریخ العربی، خانەی الثقافة، بەیرووت ١٩٦٩، ل١٩١.

بیریان کردەوە هەرگیز لە تواناد‌ا نییە مل بۆ باری نیشتەجێبوون کەچ بکرێت، هەرچەندە خاچپەرستانی کۆن نوێ هەوڵ بدەن لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە و سروشت و جۆری پێکهاتەی ناوچەکەدا بگونجێن.

## پاش عەکا و سەرنەکەوتنی داگیرکردنەوەی قودس

دوای ئەوەی ریچارد عەکای گرت، بیری بۆ ئەوە چوو شارەیلی کەناراوی شام بگرێتەوە، ئەوانەی سەلاحەدین پاش حەتین داگیریانی کردبوو. جا لە سەرەتای شەعبانی ٥٨٧ک/ کۆتای ئابی ١١٩١ز، سوپایەلی خۆی بەرەو حەیفا بەرێ خست، ئەو دەمە سەلاحەدین دەنگی سەربازانی خۆی دا و فەرمانی پێیان دا دوای لەشکری خاچپەرست بکەون و نەهێڵن ئامانجەکەی بێنێتە دی. ئەگەرچی چەند جارێک بە یەکدادان رووی دا، بەڵام خاچپەرستان توانییان بچنە ناو حەیفا و لەوێشەوە بچنە قیساریە، سەربازانیان لە رێگەدا تووشی زۆر ئاستەنگ و دەردەسەری بوون، بە تایبەتی لەبەر سەختیی رێگاکە. بۆیە ریچارد سەرلەنوێ پێوەندیی بە سەلاحەدینەوە کرد بۆ وتووێژکردن و ئاشتی. سەلاحەدین گومانی لە نیازی ریچارد کرد، وێڕای ئەوەش جارێکی تر مەلیکی عادلی برای نارد بۆ وتووێژ، زمانحاڵی ریچارد لە دیدەنیی مەلیکی عادل گوتی: کوشتار لە نێوانماندا درێژەی کێشا، لە هەردوو لا زۆر پیاوی قارەمان کوژران، ئێمە بۆ یاریدەدانی فەرەنگەکانی کەناراو هاتین، ئێوە و ئەوان رێک بکەون و با هەر یەکێکمان بگەڕێینەوە شوێنی خۆمان[٢١٣]. عادل ـ لێی پرسی: مەرجەیلی ئاشتی چین؟ ئەویش وەڵامی دایەوە: "دەبێ وڵات هەمووی بۆ ئێمە بێت، ئێوەش بچنەوە وڵاتی خۆتان"، مەلیکی عادل رازی نەبوو و پێی گوت: هەرچی سوارە و پیادە هەیە بکوژرێن شتی وا نابێت[٢١٤]. بە توورەیی هەستا و رۆیی. ریچارد بەرۆخ کەناراودا رۆیشت و کەشتییەکانیشی لە تەکدا، بە هیوای ئەوەی شارەکانی کەنار زەریا هەمووی بگرێت. کە ئەوەشی کرد بەرەو ناوەوەی وڵات و قودسی پیرۆز بچێت.

سەلاحەدین زانیی سەربازانی بە چەکی سووکیانەوە دەرەقەتی دوژمنێکی پڕ

---

٢١٣. ابن شداد، النوادر، ل١٨٢.

٢١٤. العماد، الفتح، ل٥٤١.

چەکی چاک و پشت بەستوو بە خۆراک و تفاق و چەکی لە زەریاوە هاتوو نایەن، ناشتوانێ لە شەڕێکی یەکلاکەرەوەدا بەرەنگاریيان بکات، بۆیە شێوازێکی تری بەکار هێنا کە پێ دەگوترێ "شەڕی پارتیزانی" کەوا سوپاکەی لە ناکاو دەستیان لە خاچپەرستان دەوەشاند و بەهۆی ئازایی و کارزانییان و نەخشەی دروستی سەرکردەوە، بەسەریاندا زاڵ دەبوون. هەتا وای لێ هات خاچپەرستان هەر خەریکی خۆپاراستن بوون لەو هەڵمەتە ناکاوانەی دەکرایە سەر پێشەنگ و مۆڵگەکانیان و سەر دەوروبەری سوپاکەی ڕیچارد خۆی، پێشمەرگە موسڵمانەکان لە هەموو لایەکەوە پەلاماریان دەدان جارێ لە پێشەوە و جارێ لە چەپ و جارێ لە دواوە.

لەگەڵ ئەوەشدا هەردوو سوپا لە ١٤ی شەعبانی ٥٨٧ک/ ٧ی ئەیلوولی ١١٩١زدا لەبەردەم (ئەرسووف) کەوتنە وێزەی یەک، ئەگەرچی موسڵمانەکانیش لە پەلاماردا دەستی خۆیان پێش خستبوو بەڵام ئەنجامی شەڕەکە لە قازانجی موسڵماناندا نەبوو، کەوا سوارەکانیان پەرت و بڵاو بوون و ٣٢ میر و ژمارەیەکی زۆر سەربازیان لێ کوژرا، کە مێژوونووسان بە ٧٠٠٠ کەسی دادەنێن و ئەوەندەی نەمابوو هەموویان لەناو بچن ئەگەر کشانەوەیان نەبا بۆ ناو دارستانێکی چڕ کە ئیتر ئەوسا خاچپەرستان ڕاویان نەنان، هەرچەندە لە هەڵوێستی چاکی خۆیان دڵنیا بوون، بەڵام لەوەی کە بەسەر دوژمنەکەیان هاتووە دڵنیا نەبوون و نەیاندەزانی ژمارەیان چەندە، یان نەخشە و پلانەکانیان چین؟ ئاخۆ بەراست شکاون یان بۆسەیەکە ویستوویانە ڕایان کێشن بۆ ئەوەی دوایان بکەن[٢١٥]؟ یان تەقەلایەکە بۆ هێرشێکی تەواو؟ خۆ ئەگەر ئازایەتیی بێ وێنەی سەلاحەدینی سەرکردە نەبوایە، کە لە جێی خۆی نەبزووت تا موسڵمانان لێی کۆبوونەوە، شەڕەکە بە مەرگەساتێکی گەورە دوایی دەهات. سەلاحەدین پێی چەسپاند، بە ناو باڵی ڕاستی سوپادا دەچووە ناو باڵی چەپ و خەڵکی بۆ غەزا هان دەدا"[٢١٦]. سەرەڕای ئەمەش نووسەرێکی ئەورووپایی بایەخی ئەوەی لە ئەرەسووف ڕووی دا دەشکێنێ و دەڵێ: ئەوەی لە ئەرسووف قەوما ناتوانین بە مانای ورد ناوی بنێین

٢١٥. ابن شداد، ل١٨٤.

٢١٦. هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

شەڕ (معركة)، بگرە هەندێ مێژوونووسان بە شتێکی ئەوتۆشیان دانەناوە، بەڵام خاچپەرستان لەو ڕووداوەدا ساخیان کردەوە کە توانییان لە دەوری ڕیچاردا کۆ ببنەوە و لە شەڕدا بەرامبەر بە هێزەکانی سەلاحەدین خۆگر و یەکگرتوو بن[217].

هەرچۆنێک بێ سەرکەوتنیان لە ئەرسووف و کوشتنی دیلە موسڵمانەکان، داگیرکردنی عەکا بەو شێوەیەی باسمان کرد، مایەی هیوایەکی نوێ بوو بۆ پەلکوتان و تەکاندان بەمەبەستی دەستکەوت و سەرکەوتنی تازە. بە پێچەوانەی ئەوانیشەوە ئەو ڕووداوانە مایەی ئێشێکی گەورە بوون لە دڵی موسڵماناندا.

دۆخی تازە وای لە سەلاحەدین کرد بۆ خۆگرتن و نەبەزین لەبەردەم دوژمندا شێوازێکی تر بەکار بهێنێ، ئەویش شێوازی خاپوورکردنی شار و شوورایەکانە، کە کردی بە شێوازێک لە شێوازەیلی بەرگری لەخۆکردن و کەمکردنەوەی زیان و ڕێ نەدان بەوەی هیچ شارێک بە ساخی بکەوێتە دەستی دوژمنەوە. بۆ نموونە دەمێک هێزەیلی ئەو گوری پاراستنی عەسقەلانیان نەما، بڕیاری دا چۆڵی بکەن، چونکە نەیویست دەستی خاچپەرستان بکەوێت، ئەوانیش هەرچی موسڵمانی تێدایە بکوژن و سوود لە شوورە و قەلاکانی ببینن و بیکەنە بنکەی سوپایی و لەوێوە پەلاماری شاری تر بدەن. هەروەها کەڵک لە ماڵ و سامان و چەک و تفاقی ناو ئەو شار و قەلایانە وەربگرن، بەتایبەتی ئەوانەی دەکەونە ئەملا و ئەولای قودس یان لەسەر ڕێی کاروانی میسرن. ئەوەبوو فەرمانی دا شوورەی عەسقەلان تێک بدەن و شارەکەش بەشەو بسووتێنن ئەگەرچی ئەمە لە دڵی دانیشتووانی گران بوو و بووە مایەی شین و "گریان، چونکە شارێکی جوان و بە ئاو و شوورە قایم و خانووبەرە گەورە و خۆش بوو، خەڵکەکە زۆر خەمبار بوون" هەروەها فەرمانی دا ڕەملە، ئەللەد، نەترون و چەند شار و شوورەیەکی تریش بڕووخێنن و وێران بکەن، زمانحاڵی سەلاحەدینیش لە بارەی وێرانکردنی عەسقەلان و شارانی ترەوە دەیگوت: "بەخوا مردنی هەموو منداڵەکانم پێ خۆشترە لەوەی دیوارێک تێک بدەم، بەڵام ئەگەر خوا ئەمری لەسەر بێت، ئەمە ڕێگەیەک بێت بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی موسڵمانان، ئیتر چ بکەم؟!"[218].

---

٢١٧. هارۆڵد لامب "شعلة الإسلام"، ل٢٣٦.

٢١٨. ابن شداد، ل١٨٦.

پاشان سەلاحەدین بڕیاری دا بەرەو قودس بڕوات، تا سەنگەر و قایمکارییەکانی پتەو بکات و کاروباری شار ڕێک بخات بۆ بەرگریکردن لێی و پاراستنی. لەو شارە پیرۆزەشەوە چاوی بە بزووتنەوەی دوژمندا دەگێڕا و هەوڵی دەدا بەهۆی تیپی هەواڵزانییەوە "فرق الاستكشاف" هەراسانیان بکات، ئەم تیپەش پێیان دەگوت "یەزەک" پیاوانیشی بە دلێری و گورج و گۆڵی بەناوبانگ بوون، لەبەر ئەوەش کە باریان لە چەک و لە خۆراک سووک بوو، لە هاتوچۆدا چالاک بوون و زۆربەشیان خەڵکی ناوچەکە بوون، بۆیە شارەزای هەوراز و نشێو و سروشتی خاکەکەی بوون و دەیانتوانی خێرا ئەو جێیە هەڵبژێرن کە بیکەنە پەناگە و خۆیانی لێ حەشار بدەن. بۆ سەرۆکایەتیی هەر یەزەکەکیش میرێکی خۆی دادەنا. ئەرکی تری ئەمانە ڕفاندنی سەربازانی خاچپەرست و ڕێگرتنی هاتوچۆ و گواستنەوەی ئازووخەیان بوو.

بەم جۆرە، قایمکارییەکانی سەلاحەدین و نەخشەکانی بۆ بەرگریکردن لە قودس لە زستانی ئەو ساڵەدا کارێکی باشی کردە سەر خۆڕاگریی شارەکە، بەتایبەتیش کە سەربازەیلی میسر بە سەرکردایەتیی میر ئەبو هەیجای سەمینی هەدبانی گەیشتنە ئەوێ. بۆیە هەر تەقەلایەکی ڕیچارد بۆ دەرهێنانی قودس لە دەستی موسڵمانان بەبادا چوو. جگە لەمەش سەلاحەدینی سەرکردە فەرمانی دا خەندەقێکی قووڵ بەدەوری شاردا هەڵبکەنن، بەرپرسیاریی بەرگریی هەر قوللەیەک لە قوللەکانی شاری بە میرێک سپارد کە کاری تێدا دەکرد، بۆ نموونە مەلیک ئەفزەلی کوڕی لە ناوچەی (باب العمود)ەوە هەتا (باب الرحمة) کاری دەکرد، ئەتابەگ عیزەدین مەسعوودی حوکمڕانی موسڵیش کۆمەڵە پیشەسازێکی شارەزای بواری بەرد بڕینی بۆی نارد.

سەلاحەدین خۆیشی لە جێی دوورەوە بە پشتی وڵاخەکەی بەردی دەهێنا، سەربازانیش چاویان لەو دەکرد، کرێکارێکی زۆر لە دەوری کۆ بووبوونەوە و ئەوەی لە چەند ڕۆژدا دەکرا ئەوان بە ڕۆژێک دەیانکرد[٢١٩].

ئیبن ئەسیر باس دەکا کە ڕیچارد داوای لە خاچپەرستە کۆنەکانی لای خۆی کرد کە نەخشەی قودس و شارەکەی بۆ دابین بکەن، ئەوانیش نەخشەکەیان بۆی

---

٢١٩. الكامل، ١٢/٧٤.

کێشا. لەسەر نەخشە ئەو خەرەندەی دیت کە لە دەوری شاردایە و سەیری سەنگەر و قایمکارییە بەهێزەکانی کرد، ئەوسا گوتی: "تا سەلاحەدین زیندوو بێت و موسڵمانان یەکگرتوو بن ئەم شارە ناگیرێت". زەحمەت گەیشتنی ئالیک و خۆراکیش بۆ شەڕکەرەیل خاچپەرست، هۆکارێکی تر بوون بۆ ئەوەی هێرشبەران بە بێئومێدی بگەڕێنەوە ڕەملە[220].

لەو ماوەیەدا کە سەلاحەدین لە قودس بوو، پەیتا پەیتا تیپەکانی سوپاکەی بەرهنگاری دوژمن دەبوون، جارێ کوشتاریان تێ دەکردن و جارێ خۆراکیان لێ دەبرین. پێش لەشکری یەکێک لەم تیپانە فارسەدین مەیمون بوو، کە میرێک بوو لە میرەکانی سەلاحەدین، پەلاماری کاروانێکی گەورەی ئازووخەی دوژمنی دا و بەتالانی برد. بەلام خاچپەرستەکانیش پاش چەند مانگێک کاروانێکی گەورەی ئازووخەیان ڕووت کردەوە کە لە میسرەوە بە سەرکردایەتیی میر فەلەکەدین کوڕی سلێمانی برای دایکیی مەلیکی عادل دەهات، توانییان ژمارەیەکی زۆر لە چادر و ئامێرەیلی کاروانەکە بەتالان ببەن بەپێی ئیبن ئەسیر[221]. بەلام لە دواییدا موسڵمانان توانییان تالانییەکانی دوژمن لە کاروانەکەی میسر وەربگرنەوە، ئەویش کاتێک سەربازانی حەلەب هاتنە لای سەلاحەدین، ئەویش بەرەو یافا بەڕێی خستن کە بەدەستی دوژمنەوە بوو..

لە یافا شەڕێکی باش قەوما، ژمارەیەکی زۆریان لە خاچپەرستان کوشت و بەدیل گرت و لە ٢٠ی ڕەجەبی ٥٨٨ک/ ١١٩٢ز، یافایان گرت و هەر شتمەکێکی تێدا بوو دەستیان بەسەردا گرت، لەوانە ئەو شتمەکانەی لە کاروانەکەی میسر بەتالان برابوون[222].

٢٢٠. الکامل، ١٢/٧٥.
٢٢١. الکامل، ١٢/٨٢.
٢٢٢. الکامل، ١٢/٨٤.

## نوێبوونەوەی وتووێژ

ریچاردیش، گەلێ گرِ و گێچەڵی سیاسییانەی هەبوو دەبوو چارەیان بکات، چ لە فەلەستین و چ لەبارەی پێوەندیی بە مەلیکی فرەنساوە، یان لە قوبرس و باری ئالۆسکاوی ئینگلتەرە. هەرچۆنێک بێت توانیی ئەو گرفتەیلە چارەسەر بکات، سەرەڕای ئەو تاوانەیلەی لەبەر دەرگای عەکادا کردی، هێشتا هەر بەتاسەوە حەزی لە وتووێژێک بوو کە سنوورێک بۆ مانەوەی لە خاکی فەلەستین دابنێ. ئارەزووی دیدەنیی مەلیکی عادلی دەکرد، دوای ئەوەی سەلاحەدین چەند جارێک نەیویست دیتەنیی بکات، بۆیە هەر کە گەڕایەوە یافا یەکسەر هەمفریی حوکمڕانی (تبنین)ی عەرەبیزانی ناردە ئەللەد -بارەگای مەلیکی عادل- بۆ تەقەلای شەڕ ڕاگرتن. خواستەیلی مەلیکی ئینگلیز گەورە و لە کردن نەهاتوو بوون، دەیویست قودس وەربگرێت، هەروەها هەرێمی ڕۆژاوای ڕووباری ئوردن و وەرگرتنەوەی خاچی سەڵبوت. کەس لەو بڕوایەدا نەبوو مەلیکی عادل بەم داخوازییانە ڕازی بێت، بەتایبەتی یەکەم و دووەمیان، لەگەڵ ئەوەشدا داخوازییەیلی خۆی پێشکێش بە کاکی سەرکردەی کرد، ئەویش وەڵامێکی گورچکبڕی بۆ نارد، کە بریتییە لە: قودس هی خۆمانە لە کن ئێمە زۆر پیرۆزترە وەکو لە کن ئێوە، چونکە جێی (ئیسرا)ی پێغەمبەری ئێمەیە و کۆمەڵگەی مەلائیکەتانی لێیە، قەت نابێ بیر لەوە بکرێتەوە کە ئێمە وازی لێ بهێنین، هەتا ناتوانین لەناو موسڵماناندا بە گاڵتەش ئەمانە بڵێین. وڵاتەکەش لە بنەڕەتدا هی ئێمەیە، ئێوە لەلاوە هاتوون و داگیرتان کردووە، ئەمەش کاتێک بوو کە موسڵمانان بێ هێز بوون، هەرچی خاچەکەیشە، لەناوبردنی لای ئێمە خێرێکی گەورەیە، ئەگەر بۆ خاتری بەرژەوەندییەکی ئیسلام نەبێ کە لەو گرینگتر بێت، ناتوانین وازی لێ بێنین"[٢٢٣].

ریچارد پاش چەند ڕۆژێک چەند پێشنیازێکی تازەی خستە ڕوو، بە ئامانجی

---

٢٢٣. ابن شداد، ل١٩٤.

هێورکردنەوەی باری دەروونیی نێوان هەردوو لا و گەیشتن بە چارەیەکی گونجاو. پێشنیازی کرد سەلاحەدین هەرچی خاکی فەلەستینی لە بەردەستدایە بیداتە مەلیک عادلی برای، عادلیش شاژنە جوانەی شاژنی سقلیە، کە خوشکی ڕیچاردە مارە بکات، ڕیچاردیش هەموو شارەیلی کەناراوی زەریا _بە عەسقەلانیشەوە- دەداتە خوشکەکەی. ئەو ژن و مێردەیش لە قودس دانیشتن بۆ ئەوەی کریستیانەیل بتوانن بچنە شارەکەوە، ئەو کاتەش دەبێ خاچی سەلبوت بگەڕێتەوە و دیلەیلی هەردوو لا ئازاد بکرێن، هەردوو تیپی خاچپەرستی داویە و ئەسپیتاریش مولکی پێشووی خۆیان لە فەلەستین وەربگرنەوە[٢٢٤].

کە ئەم پێشنیازانە گەیشتە خزمەت سەلاحەدین، دای لە قاقای پێکەنین و بە گاڵتەی زانی، لەگەڵ ئەوەشدا بە پرۆژە (مرۆڤانەکەی) ڕیچارد ڕازی بوو، تا دوژمنەکەی تاقی بکاتەوە و بزانێ بایی چەند ڕاستیی لەلایە؟ کاتێک کە ڕیچارد پرۆژەکەی پێشانی خوشکەکەی دا، خوشکەکەی ڕازی نەبوو شوو بە پیاوێکی موسڵمان بکات؟ نابێ مەگەر ئەو پیاوە ببێتە کریستیان، بۆیە داوای لە عادل کرد ببێ بە کریستیان بۆ ئەوەی خوشکەکەی ئەرێ بدات. بێگومان مەلیکی عادل ئەم بیرۆکە مەترسیدارەی ڕەت کردەوە. پاشان ڕیچارد گوتی سازە لە جیاتی خوشکەکەی، خوشکەزایەکی بداتێ کە لەژێر سەرپەرشتیی خۆیدایە و بە پێچەوانەی جوانە، کە کچ نەبوو و ژن بوو و لەژێر سەرپەرشتیی پاپا بوو. جا ئەگەر سەلاحەدین و براکەی ئەم بیرۆکەیە پەسند بکەن ئەوا مەلیک دەگەڕێتەوە ئەوروپا. مەلیکی عادل توانیی بە شێوازێک خۆی لەو پێشنیازە بدزێتەوە بەبێ ئەوەی مەلیک توورە بکات، هەروەها مەلیکی عادل لەم وتووێژەیلەدا ساخی کردەوە کە دیپلۆماستێکی لێهاتووە.

هەر لەو ڕۆژانەدا، (کۆنراد) بەناوی خاچپەرستەیلەوە هەوڵی وتووێژی دا و ڕای گەیاند کە واز لە عەکا دێنێت بە مەرجێک بەیرووت و سەیدا وەربگرێت، لە هەموو خاچپەرستەیلیش جیا دەبێتەوە. سەلاحەدین پێشنیازەکەی پەسند کرد بەمەرجێک کە چەک لە ڕووی ڕیچارد هەڵبگرێت. بەڵام کۆنراد ئەمەی قبووڵ نەکرد، لەبەرئەوە وتووێژەکە وەستا.

---

٢٢٤. ابن شداد، ل١٩٥.

لەبەر ئەوەیش کە دوو پۆلە نوێنەری سەلیبیان وتووێژیان دەکرد، سەلاحەدین داوای کرد ئەنجوومەنێک لەگەڵ گەورە ڕاوێژکەرەیلی لە سەرکردە و میر لەشکران ببەسترێت، تا پێکەوە بڕیار بدەن لەگەڵ کام لا، لەم دوو لایە، وتووێژ بکەن. مەلیکی عادل لای وابوو لەگەڵ ڕیچارد بەردەوام بن، نەک لەبەرئەوەی دانی پێدا بنرێت کە مەلیکی فەلەستینە، بگرە لەبەرئەوەی پاش ئاشتبوونەوە فەلەستین بەجێ دەهێڵێ، کەچی کۆنراد دەیەوێ لە فەلەستین نیشتەجێ بێت.

زستانێکی سەختی ساڵی ١١٩٢/٩١ هات، سەلاحەدین نیزیکەی نیوەی سوپاکەی بەرەڵا کرد و لە قودس دانیشت، چاوەڕوانی هاتنی سوپای میسری دەکرد. ڕیچاردیش چوار مانگی لە عەسقەلان ڕابوارد، پاش ئەوەی شوورەکەی چاک کردەوە کە سەلاحەدین ڕووخاندبووی و کردیە قایمترین قەلای هەموو کەناراوی فەلەستین. ماوەی وتووێژ زۆر درێژەی کێشا. چەند پرۆژەیەکیش خرانە ڕوو بۆ ڕێککەوتن. هەردوو لاش لە کۆڕی وتووێژدا نەرمییان پیشان دەدا، بەتایبەتی نوێنەرێکی پایەبەرزی کڵێسە لە ئینگلتەرەوە هاتە لای ڕیچارد و باری ئاڵۆزی ناو وڵاتی تێ گەیاند، کەوا براکەی عەرشی زەوت کردووە و خەڵکەکە تکای لێ دەکەن بگەڕێتەوە نیشتمان.

ڕیچارد دەبوو مەسەلەی مەلیکایەتیی قودس ببڕێتەوە، هەرچەند شارەکە هەر بەدەست سەلاحەدینیەوە بوو. بەهێزترین ناودێرەیلی تاج لەسەرنان دووان بوون: شای پێشوو، گی دی لۆسینیان و مارکیز کۆنراد - زۆربەی سەرکردە خاچپەرستەکانیش دەیانویست کۆنراد ببێتە شا. ڕیچاردیش ئەمەی پەسند کرد، بەلام لەو کاتەدا کۆنراد بە دەستی دوو کەس لە ئیسماعیلیەلەوە هاتە کوشتن، ئەم دووانەش یەکێکیان کوژرا و ئەوەی تریان هاتە گرتن و دانی بەوەدا نا کە سینانی شێخی جەبەل بۆ ئەم ئەرکە ڕای سپاردووە و پاشان لەدار درا. بۆ کوشتنەکەش پەنجەی تاوانبارکردن بۆ ڕیچارد درێژ کرا. سەلاحەدینیش پێی خۆش نەبوو کۆنراد کوژرا، چونکە دای نابوو ئەگەر وتووێژ لەگەڵ ڕیچارد سەری نەگرت، لەگەڵ ئەودا بیکات. لەوەش بەولاوە پاش کوژرانی کۆنراد، ڕیچارد خۆی بە تاکە لایەنی لێهاتوو و هەق بەدەست دەزانی بۆ وتووێژکردن.

عیمادی ئەصفەهانی لەم ڕووەوە دەڵێ: "پێیان خۆش نەبوو مەرکیس کوژرا،

ئەگەرچی لە شەیتانەیلی گومڕا بوو، چونکە دوژمنی شای ئەلانکتیر (ئینگلتەرە) بوو و لەسەر تەختی شاهانە لە بەربەرەکانێدا بوو، نامەشی بۆ دەناردین کە دژی ئەو پشتی بگرین. مەلیکی ئەلانکتیریش هەر کە گوێی لێ بووایە نامەبەری مەرکیس هاتووەتە لای سوڵتان، ئەویش سەری بۆ نوێنەر ناردن دادەنواند و داوای ئاشتبوونەوەی دەکرد. بەڵام کە مەرکیس کوژرا، دڵی داکەوت، ترسی نەما، دڵی خۆش بوو و خراپەکاریی ئەو پەلی هاویشت[225].

پاش کوژرانی کۆنراد، ڕیچارد بووە ئاغای سەربەخۆی کاربار و دەسەڵاتی خۆی بەسەر هەموو خاچپەرستانی ناوچەدا، بە شاری سووریشەوە بڵاو کردەوە. جا بۆ مەلیکایەتی شانشینی خاچپەرست، هنری دی شامپاینی هەڵبژارد کە لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا بە (الکندهری) ناسراوە، کە لە لایەکەوە خوشکەزای ڕیچارد خۆی بوو، لەلایەکی تریشەوە خزمی شای فرەنسا بوو. بۆ گی دی لۆسینیانی شای پێشوو و هاوپەیمانی خۆیشی تۆڵەی کردەوە و دورگەی قوبرسی دایە.

ئەمە بەم شێوەیە ڕۆیشت. ڕیچارد دەستی کردەوە بە هەوڵی وتووێژ، بەڵام سەرەڕای ئارەزووی گەڕانەوە بۆ نیشتمانی خۆی، هەڵوێستی لە پێشوو بەهێزتر بوو، بەهۆی چەند دەستکەوتێکی نوێوە، ئەوەبوو (داروم)ی دواقەڵای موسڵمانانی لەسەر کەناراوی فەلەستین گرت. لە بەرامبەر ئەمەشدا سەلاحەدین بەرەو (یافا) چوو و شارەکەی گرت بەڵام ماوەی نەبوو قەڵاکەی بگرێت، چونکە قەشەیەک زوو خۆی گەیاندە ڕیچارد و پێی گوت هێشتا قەڵاکەی شار بەدەستیانەوە ماوە و سەرۆکەیلی شاریش نوێنەریان ناردووەتە لای سەلاحەدین بۆ وتووێژ. ڕیچارد بە کەشتییەکانیەوە لە کەنار دابەزی و هێرشێکی لە ناکاوی بردە سەر هێزەیلی سەلاحەدین کە توندوتیژ و بەهێزتر بوو، ئیتر سوڵتان چاری نەما فەرمانی بە سوپاکەی دا بکشێنەوە. بەم جۆرە ڕیچارد یافای گرتەوە[226].

---

٢٢٥. العماد الکاتب "الفتح القسی"، ل. ٩٠.

٢٢٦. ابن شداد، ل٢٢٧.

## پەیمانی ڕەملە

سەلاحەدین بە سوپایەکی تازەی پێکهاتوو لەو شەرکەرمیلەی لە میسر و لە جزیرەوە هاتبوون گەڕایەوە شاری ڕەملە، ریچاردیش نەخۆشیی تاداری شەکەتی کرد، لە خێوەتی خۆی دەرنەدەچوو و لە هەموو کاتێک زیاتر چاوەڕوانی ئاشتبوونەوەی دەکرد، نوێنەرانی خۆی ناردە لای سەلاحەدین، بەلام سولتان پێی لێ داگرت و داوای کرد شاری عەسقەلان بدرێتەوە موسلمانەیل، هەر مەسەلەی ئەم شارەش بووە کۆسپی سەر ڕێی ئاشتی. ریچارد ئەم جارە ناردییە لای مەلیکی عادل تکای لێ کرد ناوبژی لەنێوان ئەو و کاکیدا بکات و واز لە عەسقەلان بهێنێ. بەلام هەلوێستی سەرکردە تۆزقالێک نەجوولا و بۆ سەلماندنی نیازچاکی هەندێ خۆخ و هەرمێ و بەفری بۆ مەلیکی تادار نارد[227].

لە ڕاستیدا هەلوێستی ریچارد ماوەی ئەوەی نەدا کە وتوویژ درێژە بکێشێت و دەستکەوت بەدەست بهێنێ، ئەوەتا (تا) بەری نادات، براکەی لە ئینگلتەرە دەستدرێژی دەکات، خاچپەرستەیلیش ماندوو بوون و هنری دی شەمپاینی خوارزای و تایەفە ئاینییە شەرکەرەکان، وایان پیشان دەدا کە باوەڕیان پێی نەماوە. گشت ئەمانە وایان کرد لە ئاشتبوونەوە و گەڕانەوە بۆ ولات پەلە بکات، هەلوێستی ڕەقی سەلاحەدینیش سەربار و بنبار، چونکە کە هەستی بە هەلوێستی شلۆقی ریچارد دەکرد، دەیگوت: من لەناو ولاتی خۆمدام، مال و مندالانم لەلامن، هەر چی و هەر کێم بوێ بۆم دێ، من پیرەمێردێکم خۆشیی دنیام بەلاوە ناوە و لێی تێر بووم و چاوم لێی وەڕز بووە، ئەو سەربازانەی زستان لەلامن ئەوانە نین کە هاوین دێنە لام، من لەو بڕوایەدام لە مەزنترین ڕێگەکانی خواپەرستیدام، هەرواش دەمێنم، هەتا خوا کێی گەرەک بێ ئەو سەردەخات"[228]. هەر لەو دەمەدا سەربازانی

---

٢٢٧. ابن شداد، ل٢٣١.

٢٢٨. ابن شداد، ل٢٢٨.

موسڵ، پاشان سەربازانی میسر، گەیشتنە مەیدان، بۆیە هەڵویستی سەلاحەدین بەهێزتر بوو.

ڕۆژی هەینی ٢٨ی ئابی ١١٩٢ نوێنەری مەلیکی عادل گەلاڵەی دوایی پرۆژەکەی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و پاش پێنج ڕۆژ "ڕیچاردی شێردڵ" پەیمانی ئاشتیی بۆ ماوەی سێ ساڵ مۆر کرد، کە وەکو (ئەبوفیدا) دیاریی کردووە، لە ٢١ی شەعبانی ٥٨٨ک/ ١ی ئەیلوولی ١١٩٢زەوە دەست پێ دەکات[٢٢٩]. ڕیچارد بەو پێیە کە مەلیکە سوێندی نەخوارد، لە جێی ئەو، سەرکردە سەلیبییەکانی تر: هنری دی شامپاین، بالیان ئەبلین و هەردوو پێش لەشکرانی تیپی ئەسپیتاری و داویە، سوێندیان خوارد. ڕۆژی دواتریش لەبەر چاوی نوێنەرەیلی ڕیچارد، سەلاحەدین پەیماننامەکەی مۆر کرد. بەم جۆرە هەڵمەتی سێیەمی خاچپەرستەیل دوایی هات.

گرینگترین بڕگەکانی بەیاننامەکەش ئەوەبوو کە شارەکانی کەناراو هەتا یافا لە باشووردا، بەدەستی خاچپەرستەیلەوە بێت و حاجییەل کریستیان سەربەستانە زیارەتی شوێنەیل پیرۆزی فەلەستین بکەن، بەمەرجێک چەک هەڵنەگرن. موسڵمان و کریستیان مافی ئەوەیان هەبێت بەناو خاکی یەکتردا هاتوچۆ بکەن. عەسقەلانیش پێویست بوو جارێکی تر وێران بکرێتەوە و ئەو ناوچانەی بەدەست تایەفەی ئیسماعیلی (باطني)یەکانەوە بوو درانە سەلاحەدین، لە توێڵەی ئەمەدا میرنشینی ئەنتاکیە و میرنشینی تەرابلوس تێکەڵ بە ناوچە خاچپەرستەکانی ئەم ئاشتینامەیە کران. ئەو کەسانەی پەیمانەکەیان مۆرکرد لە سەرکردەکانی سەلاحەدین ئەمانە بوون: مەلیکی عادل ئەبوبەکر، مەلیکی ئەفزەڵ عەلی و مەلیکی زاهیر غازی، هەردوو کورانی سەلاحەدین، عەلی کوری ئەحمەدی مەشتوبی هەکاری، بەدرەدین دلدرم، مەلیکی مەنسور محەممەد کوری تەقیەدین عومەری سەروەری حەما و ئیبن موقەدەمی سەروەری شیزەر و کەسەیلی تر[٢٣٠].

ئەگەرچی هەردوو لا بە ئاشتییەکە شاد بوون بەلام سەلاحەدین بەدڵی نەبوو.

---

٢٢٩. ابو الفدا الايوبي "المختصر في اخبار البشر"، خانەی کتێبی لبنانی، بەیرووت، بەرگی ٥، ل١٠٩.

٢٣٠. ابن شداد، النوادر، ل. ٢٣٥ ابو الفدا، المختصر، ٥/.١٠٨

ئیبن شەدادی ژینامەنووسی خۆی، دەگێڕێتەوە: "ئاشتیی نەدەویست، لەم بارەیەوە لە نێوان قسەدا جارێک گوتی: واز نەهێنم موسڵمانانیش بەقڕ دەچن". ئیبن شەداد لە کۆتای قسەکانیدا دەڵێ: ئەمە دەقی قسەی ئەو بوو، بەڵام بەرژەوەندی لە ئاشتیدایە[231].

هەر ئەو مێژوونووسە لای وایە کە بەڕاستی ئاشتی لە چاکەی موسڵمانەیلدا بوو، خۆ ئەگەر پێش مۆرکردنی ئاشتینامەکە سەلاحەدین بمردایە ئیسلام تووشی مەترسی دەهات، "بۆیە ئاشتی سەرکەوتن و بەختیاریی ئەو بوو، بەزەی خوای لێ بێ".

نەک هەر ئەمە، بگرە سوڵتان بیری لەوە دەکردەوە ئەگەر هەلی بۆ بسازێت هێرش بباتە سەر ئەوروپا، ئەم نیازەشی لای مێژوونووسەکەی خۆی درکاندووە، ئەویش لە یاداشتی ڕۆژانەی خۆیدا تۆماری کردووە و باس دەکا سەلاحەدین لێی پرسیوە: شتێکت بۆ باس بکەم؟ گوتم: بەڵێ. گوتی ئارەزووم ئەوەیە ئەگەر خوا بۆی بڕەخساندمایە پاشماوەی کەناراو بگرم، وڵاتم دابەش دەکرد و وەسیەتم بەجێ دەهێشت و ماڵئاواییم دەکرد و بە زەریادا بەرەو دورگەکانیان دەچووم (ئەوروپا و دورگەکانی دەریای ناوەڕاست) دوایان دەکەوتم، یان دەمرم یان یەکێکم نەدەهێشت لەسەر زەوی کفر بە خوا بکات. پاشان گوتی: مەبەستم ئەوەیە جوانترین مردن بمرم[232].

پاش ئەوەی ئاگری شەڕ دامرکایەوە، کۆمەڵێک شەڕکەری خاچپەرست، دوای ئەوەی چەکی خۆیان دانا، بۆ زیارەتی شوێنە پیرۆزەکان چوون، بەڵام ڕیچارد نەیویست زیارەتی قودس بکا و دیدەنیی سەلاحەدینیشی نەکرد هەتا ڕۆیی. قەشەیەک لەگەڵ کۆمەڵێک زیارەتکەر چاوی بە سەلاحەدین کەوت و لەگەڵی دانیشت و گفتوگۆی لەگەڵدا کرد. دوای ئەوەی قەشەکە ماڵئاوایی لێ خواست، سەرکردە دیارییەکی پێشکێش کرد، یەکێک لە پیاوەیلی کەنیسە داوای لە سەلاحەدین کرد ڕێ بدات دوو قەشەی لاتین (ئەوروپایی) و دوو شەماشەی لاتین لە کەنیسەی قیامەت و بەیت لەحم لە ناسرە نوێژ و ڕێوڕەسمی ئاینی بەجێ بهێنن،

---

231. ابن شداد، ل235، ت.

232. هەمان سەرچاوە، ل244.

ئەویش داخوازییەکەی قبووڵ کرد[٢٣٣].

لەو کاتەشدا سەرکردە لە قودس بوو، دەستەیەک نوێنەری ئیمپراتۆری ڕۆم، ئیسحاق ئەنجیلۆس هاتنە لای، داوایان لێ کرد سەرۆکایەتیی کەنیسەی ئەرتۆدۆکس بکەوێتە دەست کریستیانە ئەرتۆدۆکسەکان کە لە سەردەمی فاتیمیدا بەدەست ئەوانەوە بوو، هەروەها سەلاحەدین داخوازییەکەی شاژنی کەرجی ڕەت کردەوە بۆ کڕینی خاچی سەڵبوت بە ٢٠ هەزار دینار[٢٣٤].

٢٣٣. رنسیمان، سەرچاوەیەکی پێشتر، ٣/١٤١.

٢٣٤. هەمان لاپەڕە.

## هەڵمەتی سێیەمی خاچپەرستەیل لە تەرازوودا

پاش بەیاننامەی (ڕەملە) هەڵمەتی سێیەمی خاچپەرستان بەدوا هات و چی تر پاش ئەم هەڵمەتە کۆمەڵانی زۆری ئەوروپایی، بە گەورە شایەلی گەورەترین دەوڵەتانی ئەورووپای ڕۆژاوا و ناوەڕاستەوە هەڵمەتیان بۆ ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی نەهێنا. ئەگەر بڕوانین دەبینین دەستکەوتی هەڵمەتەکە لەچاو گەورەیی قەوارە و ئاستی شا و سەرکردەیلی هەڵمەتەکەدا شتێکی کەم بوو، ئەوەیش کە مارکیز کۆنراد کردی بۆ ڕزگارکردنی سوور و بە هاناهاتنی تەرابلوس لە دەریاوە، ئەمە پێش هەڵمەتەکە بوو، هەموو بەشداریی خاچپەرستەیلی هەڵمەتی سێیەم بۆ پینەوپەڕۆکردنی مەملەکەتەکەیان کە لەژێر زەبرە بەئێشەکانی سەلاحەدیندا هاتە لەرزین، تەنیا گرتنی عەکا و شارەیلی لێوار بوو هەتا (یافا).

لە ئەنجامی داگیرکردنی عەکا، بەو شێوە ناشیرینەی باس کرا، توانییان مەملەکەتی بەیتول مەقدیس وەربگرنەوە، بەڵام بەبێ (قودس) کە هەر بەدەست موسڵمانەیلەوە مایەوە. ئەم مەملەکەتەش ئەگەرچی بچووک بوو، توانیی ١٠٠ ساڵ بژی. لە سەرووی باکوریشەوە بوهیمندی میری ئەنتاکیە بەهۆی سیاسەتی بێ لایەنی خۆیەوە توانیی میرنشینەکەی بپارێزێت، ئەگەرچی دەوروبەرەکەشی لەدەست دا، کورەکەشی تەرابلوسی شامی لەدەست مایەوە و تایەفەی ئەسپیتاریش (حصن الاکراد) و داویە (ئەنتەرتوس)ی وەرگرت، لەگەڵ ئەمانەشدا نەیانتوانی ئەو ئامانجەی کە لە پێناویدا هاتبوون بیهێننە دی، ئەویش دەرهێنانی قودس بوو لەدەستی موسڵمانەیل.

## مردنی سەلاحەدین

پاش ئەوەی سەرکردەی گەورە لە هەموو ئەو شەڕایلەدا بەشدار بوو، هێزی لێ بڕا، ئەگەرچی کە مرد تەمەنی لە ٥٤ ساڵ تێپەڕی نەکردبوو، لە شاری قودس نەجووڵا هەتا لەوە دڵنیا بوو کە ریچارد لە عەکاوە زەریا و زەریا گەڕاوەتەوە وڵاتی خۆی، ئەو کاتە ئەم خەریکی ڕێکخستنی کارباری فەلەستین بوو، خۆیشی بۆ گەڕانەوە بۆ میسر ساز دەکرد، ئاواتیشی بوو حەج بکات و بە زیارەتی هەردوو حەرەمی پیرۆز شاد بێت، بەڵام ئەو بارودۆخەی پێیدا تێپەڕی لە ئاواتەیلی ئەو بەهێزتر بوو. پێویست بوو بچێتە دیمەشق. کە لە ٢٦ی شەوالی ٥٨٨ک/ ٤ی تشرینی یەکەمی ١١٩٣ز گەیشتە شار، پاش ئەوەی ماوەی سێ حەوتوو بەو ناوچانەدا گەڕا کە لە جەنگی داگیرکاری خاچپەرست ڕزگاری کردبوون. لە دیمەشق ئێجگار بە گەرمی پێشوازیی لێ کرا. لەو شارەدا ئیش و کارێکی زۆر کەڵەکە بووبوون، لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا کە بەسەر زینی ئەسپەوە ڕای بوارد، چاوەڕوانی ئەوەبوون لەو زستانەدا تەواو بکرێن، بۆیە نەیتوانی حەجەکەی بکات یان سەر لە میسر بدات، حەزیشی کرد هەر لە دیمەشق بمێنێتەوە کە زۆری پێ خۆش بوو و لەلای ئەو لە شارانی تر پەسندتر بوو. منداڵە گەورە و بچووکەکانیشی هەر لەوێ بوون. پاشان مەلیکی عادل هاتە لای. بەڕۆژ چەند سائێک دەچووە ڕاو لە هەواری سەردەمی منداڵیی خۆیدا[1].

پاشان ناردی بە شوێن قازیی مێژوونووس ئیبن شەداد، کە ئەو وەختە زیارەتی قودسی دەکرد، کە هات سەلاحەدین زۆر بەگەرمی بە پیریەوە چوو و بەخێری هێنا. وا دیارە ئەم مێژوونووسە لەو ڕۆژەوە هاتووەتە لای تا ڕۆژی مردنی لە حاڵەتی زۆر پێویستدا نەبووبێت سوڵتانی بەجێ نەهێشتووە. بۆیە زۆر بە وردی و بە شێوازێکی پڕ لە ڕاستی و خۆشەویستی و ڕێزگرتنی سەرکردە، ئەو چەند ساتەی پێش مردنەی تۆمار کردووە. بەنموونە سەرکردە لە حاجییانی پرسیوە کە بەهۆی قوڕی ڕێگەوبانەوە دواکەوتوون و چۆن کە هاتوونەتەوە بە پیریانەوە چووە و

ڕێگەوبانی لەئاو پاک کردووەتەوە، پاشان دەڵێ سەرنجم دا سوڵتان کەزاغەندەی[٢٣٥] لەبەر نییە، کە توجار بەبێ کەزاغەندە سوار نەدەبوو، لەبەر ئەمە ئیبن شەداد خەم دای گرت و دڵی بۆ سەرکردەی خۆی داخورپا[٢٣٦]. پاشان بەوردی باسی نیشانەکانی نەخۆشی زەردەتا (الحمي الصفراوية) دەکا کە دوای بێ تاقەتی و ئارەزوو نەکردنی خواردن دەستی پێ کرد، وەختێ سفرە داندرا نەیتوانی بەشدارییان بکات، لە جیاتی خۆی مەلیکی ئەفزەڵ عەلی، لەسەر سفرە دانیشت، ئەمەش مایەی پەرۆشیی خەڵکەکەی ئەوێ بوو.

قازیی فازڵیش لەگەڵ مێژوونووسەکەدا بوو لەو ڕۆژەوە کە سوڵتان نەخۆش کەوت. سوڵتان تای لێ دەهات لەگەڵ سەرئێشە و ئارەقەیەکی زۆر و وشکیی لەشی و ڕۆژ بەڕۆژ دۆخی تەندروستیی خراپتر دەبوو، هەتا لە ڕۆژی نۆیەمدا پاش لەرزێک لەهۆش خۆی چوو و دەرمانی نەخواردەوە خەڵک تا بڵێی خەمبار بوون، هەموو شەوێک چاوەڕوانی گەڕانەوەی قازیی مێژوونووس و قازیی فازڵیان دەکرد لە سەردانی سەرکردەی نەخۆش لە ماڵی خۆی لە قەڵادا و لە پەڕەی دەموچاویان هەواڵی چاک و چۆنیی سەرکردەیان دەخوێندەوە. باری تەندروستیی ئەو بەرەو خراپتر چوو و هێزی لێ برا، ئەو دەمە مەلیکی ئەفزەڵ چاری نەما، میر و سەرکردەکانی سوێند دا کە هەتا سەر دڵسۆزی بنەماڵەی سەلاحەدین بن هەروەکو پێش مردنی[٢٣٧].

لە ٢٧ی سەفەردا (شەوی دوازدەیەمی نەخۆشییەکەی) زۆر تێک چوو، داوا لە مێژوونووس و لە قازی کرا ئەم شەوە لای سەرکردە بمێننەوە. بەڵام قازیی فازڵ قبووڵی نەکرد و گوتی: خەڵک چاوەڕوانمان دەکەن کەی لە قەڵا بێینە خوارێ، خۆ ئەگەر ئەم شەوە نەچینە خوارێ لەوانەیە بیکەنە هەرا و یەکتر تالان بکەن. هاتینە خوارێ و هەر یەکەمان خۆزگەمان دەخواست گیانی خۆمانی بەقوربان بکەین. ئیتر ئەو کۆچی دوایی کرد، ئەو ڕۆژەش ڕۆژێک بوو موسڵمانەیل و دینی ئیسلام

---

٢٣٥. کەزاغەندە، کراسێکی بەر ئاوریشمە، لە پاڵتۆیەکی کورت دەچێ، لە کاتی شەڕدا دەکرایە بەر.

٢٣٦. ابن شداد، ل٢٤٢.

٢٣٧. هەمان سەرچاوە، ل٢٤٤.

لە ڕۆژی مردنی خەلیفەکانی ڕاشیدینەوە تا ئەوسا کۆستی وایان نەکەوتووە.

پاش بەڕێکردنی تەرمی سەلاحەدین قازیی فازڵ شیرەکەی هەڵگرت و بردی لەناو گۆڕەکەی لە تەنیشتی درێژی کرد، پێی گوت: ئەی سەرکردەی مەزن، لە گەشتی بەرەو بەهەشتت ئەمە بکە داردەستی خۆت، جا هەموو دایانە پڕمەی گریان.

## ژینامەی پیاوی هەرە درەوشاوە

ئەرێ کام مامۆستای سوارچاکی بەم شێوە ئەفسانە ئاسایە ژیانی بەسەر برد، جگە لە سەلاحەدین کێ شایانە ببێ بە نموونەیەکی پێشەنگ بۆ ئەوانەی دوای خۆی هاتوون؟

هەر خۆی بوو ئەو سوارچاکە مامۆستایە، کە نیشتمان و هاونەتەوە و هاوئاینەیەل شانازیی پێوە دەکەن و وەکو ئەفسانەیەکی بەجۆش، دەیڵێن و دەیڵێنەوە. ئەو لە گشت سوارچاکێک زیاتر ـکە ڕووبەڕووی دەستدرێژی دەبوونەوە- بەسەر پشتی ئەسپەوە بووە. زینی ئەسپەکەی، تا چارەکە سەدەیەک، ماڵ و ئارامگەی بووە، کە نەخۆشیش دەبوو و دەیانبردەوە چادرەکەی نەخۆشییەکەی گرانتر دەبوو، بەڵام کە بەسەر خانەی زینی ئەسپەکەیان دەخست هەستی بە چاکبوونەوە دەکرد و دەردەکەی لەبیر دەکرد، خەڵک هەر بە سواری دیتبوویان و هەر جلوبەرگی مەیدانی لەبەردا بوو چ (لامەم) و چ کزاغەندە.

ئەم پیاوە ژینامەیەکی لە ڕووناکی گەشتری بەجێ هێشت، ئەو ڕێ بۆ هەموو ئەوانە ڕووناک دەکاتەوە کە دەیانەوێ ڕێ پێ بزانن و بگەنە قۆناغ. هەر ڕێبوارێکی ئەم ڕێیە، لەم وڵاتەدا لای وایە دەبێ پشکۆیێک لەو وەربگرێت و ڕێی خۆی پێ ڕووناک بکاتەوە تا چاوساخانە بەئامانج دەگات[٢٣٨]. سەلاحەدین پێویستیی چەرخێک بوو، هیچ قارەمانێکی تر لە ڕۆژمێلێکی تردا جێی ئەوی نەدەگرتەوە، بگرە سەردەمەکەی ئەو لەوە زیاتر بوو کە ڕووداوێکی سەرپێیی لە مێژووی شەڕەکانی خاچپەرستان پێک بهێنێ و یەکێکە لەو ساتە نایاب و بەهادارانەی مێژووی مرۆڤایەتی، کاتێ کە نەخشەکێشانی ڕەوشتییانە و یەکەتیی ئامانجی ئەم مەردە، پاڵی بە پیاوانی سەردەمەوە نا بکەونە شوێنی، چونکە ئەو بەها بەرزانەی

---

٢٣٨. عبدالعزیز سید الاهل "ایام صلاح الدین"، نووسینگەی بازرگانیی چاپ و بڵاوکردنەوە و وەشاندن، بەیرووت ١٩٦١، ل٦.

کردیانی بە بەرنامەی کار، گومانیان لە مەبەست چاکی مرۆڤانەیدا نەهێشت[٢٣٩].

ئەم سەرکردە بەهرەدارە دەبوو هەموو کۆسپێک تەخت بکات تاکو یەکەتیی واتەیی دروست بکات، یەکەتییەک ساخی بکاتەوە -ساخیشی کردەوە- کە هێزێکە دەتوانێ ڕووبەڕووی شەڕخوازیی خاچپەرستانە بوەستێ. بەتایبەتی هەرچی دەستکەوت و قازانجی کەسییە بەلاوەی نا، سەرەڕای ئەو سەختی و دەردەسەرییانەی لە پێناوی ئەم بەها و نموونە بەرزانەدا تووشی بوون.

سەرچاوە مێژووییەکان بەڕوون و درەوشاوەیی باس دەکەن کە چۆن هەموو سەریان لەوە سوڕ ماوە ئەم مەردە چۆن نەیدەویست دەسەلاتداری بنوێنێ، یان شمەک بۆ خۆی کۆ بکاتەوە؟ بەڕاستی لای وا بوو سامان دەبێ بۆ هێنانە دیی ئامانجی غەزای دینی بەکار بهێنرێت[٢٤٠]. نموونەیەک لە نموونە زۆرەکان کاتێک قەلای (ئامەد)ی ناوچەی جزیرەی فوراتی سەروو بەخۆی و گەنجینە مەزنەکانیەوە، بەبێ دەست لێدان بە حوکمڕانی بەزیوی قەلاکە پێشکێش کرد، دوای ئەوەی سەری بۆ سەلاحەدین دانەواند، بەمەش بۆ دۆست و دوژمنانی سەلماند کە بای مووێک ئارەزووی دنیای نییە.

هەموو دوژمن و ناحەزانی خۆی سەرسام کرد، چونکە ئەوان لایان وا بوو وەکو خۆیان ئارەزووی دنیاداری و مەزنایەتی دەیجوولێنێ، چاوەڕوان بوون وەکو خۆیان گەمەی سیاسی بکات، بەلام بەپێچەوانەوە، هەروەکو نووسەرێکی ڕۆژاوایی دەڵێ، ئەوەندە پاک بوو بەڕادەیەک نەیدەویست بزانێ بەرامبەرەکەی چ فێڵ و مەکرێک دەکات، بۆیە هەندێ لە ئەندامەیلی بنەماڵەکەی و خەڵکی تریش ئەم سیفەتەیان بە بێهێزی لێک دەدایەوە و جاروبار کەڵکیان لێ وەردەگرت، بەلام لە دواییدا سەری خۆیان لە بەردی دڵسۆزیی بێ پێچ و پەنای خزمەتی نموونە بەرزەکانی ئەو دەدا، دڵسۆزییەک کەس نەیدەتوانی لە هەڵوێستی خۆی لای دا[٢٤١].

سەلاحەدین لای وا بوو لاوازیی قەوارەی سیاسیی ئیسلام هەلی بە دامەزراندنی وردە دەوڵەتە خاچپەرستەکان و مانەوەیان داوە، ئەم لاوازی و بێهێزییەش ئەنجامی

---

٢٣٩. جب "صلاح الدين"، ل١١٨.

٢٤٠. هەمان سەرچاوە، ل١٢٥.

٢٤١. هەمان سەرچاوە، ل١٩٢.

داڕزانی ڕەوشتی سیاسییە، ئەوەبوو شۆڕشی دژی ئەو درندانە بەرپا کرد. بۆ چارەسازیش تەنیا ڕێگەیەک هەبوو، ئەویش بووژاندنەوەی قەوارەی سیاسیی ئیسلام بوو لە سێبەری دەوڵەتێکی یەکگرتوودا، نەک بە سەرۆکایەتیی خۆی، بگرە بە سەرۆکایەتیی شەرعی ئیسلام و بە سەرپەرەوەریی خیلافەتی عەباسی.

حوکمڕانەیلی ولاتان و میرەیەل لایان وا بوو مەرسوومی خەلیفەی بەغدا بە دامەزراندنیان لە پلە و پایەکانیاندا شتێکی ڕواڵەت و ڕووەکییە و بۆ جێبەجێکردنی مەبەست و ئاواتەکانیان پێڕەویان دەکرد، بەلام سەلاحەدین بەڕاستییەکی پێویست و ئەرکی سەرشانی دەزانی. ئەمەش لەو دەیان نامەیەدا دیارە کە بۆ دیوانی خیلافەتی بەغدای ناردووە کە لە بۆنەی گرینگدا بە پێنووسی ڕەوانبێژی نووسەرەیلی ئەو چەرخە، وەکو قازیی فازڵ و عیمادی کاتبی ئەسفەهانی نووسرابوون. ئەم وێنەیەی سەلاحەدین لە دەفتەرەیلی مێژوودا هەتا لە کن دوژمنە خاچپەرستەکانیشی تۆمار کراوە، ئەوەتا ولیەمی سووری، بەناوبانگترین مێژوونووسی خاچپەرستی هاوزەمانی سەلاحەدین دەڵێ: هەر پەرەسەندنێکی بەهێزی ئەم سەرکردەیە هۆیەک بوو بۆ پەیداکردنی گومان لە بەرچاومان. چونکە پیاوێکی بەپرس و ڕا و ژیر، لە شەڕدا ئازا و تا ئەوپەڕی سنووری جوامێری جوامێر و ڕەوشت بەرز بوو[٢٤٢].

هەندێ لە مێژوونووسەیلی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا، ئەو سەرکەوتنە گەورانەی لە ماوەیەکی کەمدا، کە ١٨ مانگ زیاتر نەبوو، بەدەستی هێنا بە بەڵگەی ئاست بەرزی و سەرکردایەتی بلیمەتی سەربازی، سەرباری توانای جڵەوگێڕی و هەڵسووڕاندنی کاروباری شەڕ دادەنێن. ئەم سەرکەوتنانەش ناگەڕێنەوە بۆ ئەو بەهرە سەربازییەی، کە ئەویش وەکو زۆر سەرکردەی تری هۆشیاری سوپاکان هەیبووە، بگرە تێگەیشتنی تایبەتییەتی. بەڵێ ئەم سەرکردەیە چەندان ڕەوشتی نایابی سەربازیی کەسیی بەرزی هەبوو، بەلام سەرکەوتنەکانی _بەڕادەی یەکەم- دەگەڕێنەوە بۆ بوونی ئەو سیفەتە واتاییانەی کە کەم لەگەڵ بەهرە ستراتیجییەکاندا یەک دەگرنەوە.

---

٢٤٢. بڕوانە: د. نظير حسان سعداوي "ثلاثة من مؤرخي الحروب الصليبية"، ل٥-١٦. د.الباز العريني "مؤرخو الحروب الصليبية"، ل١٠١-١١١.

سەلاحەدین سوڵتانێکی شەڕوانی وا نەبوو کە هەر سوپا کۆ بکاتەوە و میر لەشکران بنێرێتە گێژەنەی شەڕ و کوشتار بۆ زیاتر ناو دەرکردن و دەستکەوت و مەزنایەتی، بگرە خۆی کردبووە نیشانەی سەربازیەتی و نموونەی شەڕوانی غەزاکەر، لە ڕێی خوادا و لە پێناو ڕزگارکردن و غەزادا وازی لە ماڵ و منداڵ و کەسوکار و نیشتمان و ڕابواردنی خۆی هێنا، لە هەموو گەنجی دنیادا، سێبەری چادرێکی شەڕی هەڵبـژارد کە "با" بە ڕاست و بەچەپدا دەیهێنا و دەیبرد، هەتا شەوێک ڕەشەبا چادرەکەی خست و ئەگەر لەو کاتەدا بە ئەرکێکی سەربازانە لە دەرەوە نەبوایە چادرەکە دەیکوشت[٢٤٣].

بۆیە ئەگەر پیاو بیەوێ نهێنیی مەزنایەتیی ئەو بزانێت، ناتوانێ لێی بکۆڵێتەوە، بۆیە دانایان گوتویانە: مەزنایەتی، یان قارەمانەتی ڕازێکی نهێنییە لە پیاودا شوێنەوارەکەی دەبینرێ و نهێنییەکەی نازانرێ. سەلاحەدین سەختترین زەبر و کارەساتی ناخۆشی بەرکەوت و لە هەموو خەڵکیش زیاتر هەستی بە گەورەیی ئەو کارەساتە ناخۆشانە دەکرد، بەلام پێی نەدەتاسا، بگرە ڕادەما و بڕیاری گەلاڵە دەکرد، پاشان بە چەسپاوی و بە وردی بڕیارەکەی جێبەجێ دەکرد. بۆ نموونە لە گەمارۆدانەکەی عەکادا دەیدیت ڕۆژبەڕۆژ هێزی دوژمن بە ژمارە و تفاق و ئامێر پەرە دەسێنێ، ئەویش بێ ئەوەی بشڵەژێ، یان ورە بەر بدات بۆ هەر گرفتێک چارەیەکی دەدۆزییەوە، یان هەوڵی دەدا بدۆزێتەوە. لە شەڕی ئەرسووفیشدا بەتەنیا لەگەڵ چەند کەسێکی کەم لە هاوڕێکانی پێی خۆی چەقاند، سوپاکەی هەلاتن. ئەو هەر خۆی گرت و ئەم هەڵوێستەی کارێکی تەواوی لە پیاوەیلی دەوروبەری کرد، ئەوانیش خۆیان گرت و چەسپان، بەمە ڕێی لە قەوماوییەکی ئیجگار دڵتەزێنی گەورە گرت. هەروەکو باسمان کرد. هەموو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون هەستی خۆشەویستیی ئەو پیاوەیان تێکەڵ بە سام و شکۆی ئەو کردووە.

سا گوێ بگرە، عەبدوللەتیف بەغدادیی گەڕیدە کە لە میسرەوە چووەتە قودس و لەو کاتەدا دیتەنیی سەلاحەدینی کردووە، خەریکی دروستکردنی شوورە و هەڵکەندنی خەندەکی دەوری شار بووە، چیی گوتووە: مەلیکێکی مەزنم دیت، بەگەورەیی خۆی چاوی مرۆڤی ڕوون دەکردەوە و دڵی لە خۆشەویستی پڕ دەکرد،

---

٢٤٣. ابن شداد، ل٢١.

نێزیکێکی دوور، سادەیەکی گوێ لە مست، ئەوانەی لەگەڵی بوون ئەویان کردبووە نموونە و چاویان لەو دەکرد و پێشبڕکێی چاکەکارییان لەگەڵ دەکرد[٢٤٤].

میرە گەورە و گچکەکانی، کە چاویان پێی بکەوتایە زیاتر گوڕی ئەرک راپەڕاندنیان بەجۆشتر دەبوو و ئازایەتی و جوامێریی زیاتریان پێشان دەدا. ئامانجیان ئەوە بوو کارەکانیان پەسند بکات.

ئێمە بە زێدەڕۆییی نازانین ئەگەر بڵێین سەلاحەدین بەهۆی ئەو توانای (دڵدانەوەیە) کە لە نێوان پیاوەیلی خۆیدا بڵاوی دەکردەوە، بووە مایەی ئەو گۆڕانەی لە دەروونی شەڕکەرەیلدا ڕووی دا. چونکە پێشەواکەیان پیاوێک بوو وای لێ کردن بە دڵ و دەروون بەرز بنەوە و بگەنە ئاستی قارەمانەتی. بەڵێ کامیان ترسنۆکە ئەوی بدیتایە ئازا دەبوو، ئەوی دوودڵ بوایە ڕاراییەکەی نەدەما و هەڵمەتی دەبرد، یاخی دەگەڕایەوە سەر گوێدێری و غەزاکردن، چونکە خۆی دەکردە نموونەی کار و ڕەفتار[٢٤٥].

هەر سەربازێک وای دەزانی سەلاحەدین چاوی لێیەتی بۆیە دەکەوتنە جۆش و لایان وا بوو دەزانێ چی دەکەن و بە شێوازی خۆی پاداشتی چاکەکار و سزای خراپەکارەیلی دەدات[٢٤٦].

بەم شێوەیە، چیرۆکی ژیانی ئەو قارەمانە مەزنانەی دوبارە کردەوە کە لەگەڵ سەربازانیاندا دەژیان و لە ئەنجامی ژیاندا بەشدارییان دەکردن، سەرباری ئەو مەزەیلیاندا، هەروەکو سێر هاملتون جب دەڵێ: تا بڵێی ساکار و پیاوێکی پاک بوو، پاک تا ڕادەی قاڵی[٢٤٧] ئیبن جوبەیری گەڕیدەی ئەندەلوسیش لەو سەردەمەدا کە سەلاحەدین خەریکی لەناوبردنی قەوارەی خاچپەرستان بوو، پێش حەتین، سێ

٢٤٤. کتێبەکەی "الافادة والاعتبار"، ل,٧٧ هەروەها بڕوانە: السبكي "طبقات الشافعية الكبري"، چاپخانەی عیسی البابی الحلبی ١٩٧٠، قاهیرە، بەرگی ٧، ل,٣٤٧

٢٤٥. قدري قلعجي "صلاح الدين الايوبي، قصة الصراع بين الشرق والغرب"، خانەی کتێبی عارەبی، چاپخانەی کۆمپانیای چاپخانە نوێیەکان، بەیرووت ١٩٦٦، ل,٤٤٥

٢٤٦. محمد فريد ابو حديد "صلاح الدين، البطل الذي انتصر علي الغرب"، کتێبی خانەی الهلال، قاهیرة ١٩٥٨، ل٢١٩.

٢٤٧. جب، سەرچاوەیەکی پێشتر، ل١٩١.

جــار بۆ ڕۆژهەڵات هـاتووه و ئـاگــەداری هـەڵمــەتی ســـەرنەكــەوتووی (زەریـا - وشكانی)ی سـەرلەشـكری ناوبانگ بەدی خاچپەرست ڕینـو دی شـاتیـون (ئەرنات) بوو، سـاڵی ٥٧٨ك/ ١١٨٢ز كـە دەیویسـت هەڵكوتێـتـە سـەر هـەردوو حـەرەمی شـەریفی مەكە و مەدینە. پەسنی سـەلاحـەدینی كردووه و باسی كرداره چاكەكانی كردووه، وەكو دروستكردنی تەكیە و تیمارگە و قوتابخانە و هەژارخانە، پاشـان ئیبن جوبەیر لە خوا دەپاڕێتەوه كە سەركەوتووی بكات و دەڵێ: كرداری چاكی ئەم سـوڵتـانە لە ژمـاره نـایەن، سـوپاس بـۆ ئەو خـوایە كـە سـەلاحی دینەكـەی وەكـو ناوەكەی كرد بە سەلاحەدین[٢٤٨].

ئەم گـەڕیدەیە باسـی هەسـتی بـەكـوڵی خـەڵكیش دەكـا لـە هـەمـوو ئـەو وڵاتانەی گەشـتی بۆ كردوون، هەر لـە مـەغریبـەوه تا میـسـر و یەمـەن و وڵاتی شـام و هەتا حیجاز و عێراق و جزیره. لەوانەیە بەجۆشترین هـەستی خەڵكی لە كەعبەی مەكەی پیرۆزدا بیستبێ، كاتێک ئیمام هەستا دروودی بۆ پێغەمبەر و بنەماڵە و هاوڕێیەلی نارد، پاشـان نزای بۆ خەلیفەی عەباسـی و میری مەكە كرد، دوایی كە هاتە سـەر ناوی سـەلاحەدین هەرچی زمانی لەدەمدا بوو كەوتە نزاكردن و دەنگی تەوافكەرانی مەكە لە دڵی ساف و نیازی پاكیـانەوه بـەرز بووەوه. دڵی خـەڵكەكە كەوتە فرِكەی سام لە ئەنجامی ئەو بەهرەیەی خوا بەو سوڵتانە دادپەروەرەی داوه، ئەوا بەندەیلی خـوا سـوپاسی دەكەن و شـایەتی چاكەی ئەون لەسـەر زەوی. ئیبن جـوبەیر هەمـوو ئەم قسـانەشی كـاتێ گوتووه سـەلاحـەدیـن نه شـەڕی حـەتین و نه قـودسـی ڕزگـار نەكردبوو، ئەم دێره هەڵبەستەشی دەستنیشان كردووه:

واذا أحب الله یوما عبده

القی علیه محبة الناس

بە دەگمـەن ڕێک دەكەوێ پیاوه مـەزنەكـان قـارەمـانەتی و مرۆڤـایەتی پێكەوه كۆ بكەنەوه، زۆر گەوره پیـاو دەبینین لە ڕەوشتدا لەكەدار بووه، یان لەبەر دڵڕەقی، یان لەبـەر هەوڵدان بۆ گــەیشنە ئامــانج بە هـەر ڕێگەیەک بێت، یان بـە دەرچوون لە سـنووری دین و یـاســا و ڕەوشـــتی بـەرز، بـگره هـەندێ مـــەزن لایان وا بـووه (چاكەكاری) پیاو زنجیر دەكات و تەنیا بۆ ئەوانەیە كە لە ئاستی ئەمـان نزمترن.

---

٢٤٨. ابن جبیر، گەشتەكەی، ل٣٤-٣٥.

بەڵام سەلاحەدین باوەڕی وا نەبوو، ئەو لەو کەمە هەڵبژاردانە بوو کە ڕەوشتی جوان و ژیریی دروست و کەسیەتیی سەرکردایەتیخوازی پێکەوە کۆ کردبووەوە، لای وا نەبوو (مەبەست پاساوە بۆ ئامراز) واتا (الغایة تبرر الواسطة) بۆیە لە غەزادا هەرچەندە بە دڵسۆزی و باوەڕەوە دەیکرد، جارێک خراپەیەکی لێ نەوەشایەوە، کەسی بە ڕەشەکوژی نەکوشت، جارێ قسەیەکی نەکرد جێبەجێی نەکات، بەڵێنێکی نەدا بەدیی نەهێنێ، لەمانەشدا بۆ دۆست و بۆ دوژمن وەکو یەک وا بوو.

هەرگیز ئاگربەستی نەدەشکاند، ڕۆژێک نەبوو پەیمانی لەگەڵ دوژمن بشکێنێ، لەگەڵ ناحەز و دوژمنانیدا ڕووبەڕوو و سەربڵندانە پەنجەبازیی دەکرد، بەدکارییەکی لێ دەرنەکەوت، دڵرەشی یان کینەی لەدڵدا نەبوو، ئەمەش لە وەسیەتنامەی بۆ مەلیکی زاهیر غازیی کوڕیدا دەردەکەوێ کە پێی گوتووە: "ئامۆژگاریت دەکەم لەخواترس بی، لە خواترسان سەری هەموو چاکەیەکە. بەو فەرمانەی خوا کردوویەتی فەرمانت پێ دەکەم کە هۆی ڕزگاریتە. لە خوێن و _خوێن ڕشتن و خوێن لە ئەستۆ گرتن وریات دەکەمەوە، چونکە خوێن ناخەوێ، ئامۆژگاریت دەکەم دڵی گەل و میران ڕابگرە و سەیری کارباریان بکە، تۆ ئەمینداری من و ئەمینداری خوای لەسەر ئەوان، چاودێریکردنی خەڵک نەبوایە بەو پلەیە نەدەگەیشتم، ڕق لە کەس هەڵمەگرە، چونکە مردن کەس ناهێڵێ، لە کێشەی نێوان خۆت و خەڵک وریابە، ئەگەر لێت ڕازی نەبن خوا لێت نابووریّ، بەڵام کێشەی نێوان خۆت و خوا، ئەگەر تۆبەت کرد خوای بەزەدار لێت دەبووریّ"[٢٤٩].

توورەبوونیشی ئەو کاتە بوو کە پاراستنی شەرەفی قسە و ئابرووی پێویستی بکردایە، کە چوارپەلی شاوری وەزیری فاتیمیی بەست و لەناوی برد، هیچ مێژوونووسێک ئەم کارەی بە زۆرداری و بێ وەفایی دانەنا، چونکە توورەبوونێک بوو لە پێناوی پیاوەتی و وەفاداریدا، کە ئەرناتیشی لە خێوەتی خۆ-یدا کوشت، کەس هەتا مێژوونووسە خاچپەرستەکانیش گلەییان لێ نەکرد. تا ئەوپەڕی داد، دادپەروەر بوو ئەگەر لەسەر خۆشی و کەسوکاریشی بوایە ڕاستی چۆنە بەجێی دەهێنا، زۆر جار تۆڵەی لە کوڕ و برازایەلی دەستاند ئەگەر یاسا فەرمانی

---

٢٤٩. ابن شداد، ل٢٣٨.

بەســـەردا بدانـایە، تا بلـێـی چاوتێــر بوو، چیی لەدەست بوایە و لـەوە زیاتریشی لەدەست بوایە خـەرجی دەکرد. لە سامـان و گـەوهەر و گوند و باخ و بێستان، یان کۆشک و سەرا و کەلوپـەلی ناومـاڵ هیـچی لەپاش خـۆی بەجێ نەهێشت کە خـاوەن ئەو دەوڵەتە مـەزنەش بوو[٢٥٠]. بەڵگەش لەوە دروسـتتر نییـە کە مـێـژوونووسـەکەی دەڵێ: کە مرد چل و هەفت درهەم و یەک گرام زێڕی لە گەنجینەدا بوو[٢٥١].

هەروەها دەڵێ هـەرچی لە کفن و دەفنیدا خـەرجمـان کرد هەمـوومـان بـە قـەرز وەرگرت، هەتا نرخی ئەو کایەی کە گۆڕەکەی پێ خۆش کرا[٢٥٢].

---

٢٥٠. محمد فرید ابو حدید، ل٢٢٢.

٢٥١. ابن شداد، ل١٧.

٢٥٢. هـ.س، ل٢٤٧.

## لە كۆتادا

ئەم پیاوە بەهرەدارە بەهرەدمرە توانیی چەند بەشێكی زۆری خاكی عەرەب لە چنگی داگیركردنی دزێوی خاچپەرست ڕزگار بكات، هەروەها توانیی ئیسلام بە ماوەیەكی كەم و بنبڕ، بە ڕەوشتی بەرز و جوامێریی خۆی، لە قوڕی نەهامەتیی ڕەوشت و سیاسەت دەربهێنێ. كاتێك سەرڕەقانە بەرگریی لە كایە بەرزەكانی ڕەوشت كرد و ئەو نموونانەشی لە ژیانی تایبەت و كرداری خۆیدا خستە ڕوو، خەڵكی هان دا بۆ یەككگرتن، ئەگەر چی یەككگرتنەكەش تەواو نەكرا بۆ بەرەنگاربوونی ئەو ململانێیەی ڕۆژان لە ڕێی دانابوو.

سەلاحەدین لە ژیانیدا بەم ڕەوشت و نموونە بەرزانە دەژیا، كە مردیش دنیای ئیسلام تا ماوەیەك لەو ڕووناكییە بێبەش بوو كە لەو پرشنگی وەردەگرت، ئەوەی ماوە هەر ئەو یادگارەیە كە دووبارەی دەكەینەوە و دەبێتە پێشەوا و چرای سەر ڕێگەمان.

دەسا ژینامەی سەلاحەدین، ڕەفتاری قارەمانەیلمان فێر بكە[٢٥٣].

---

٢٥٣. قدری قلعجی، ل٤٥٣.

## ناوەڕۆک